# " لەبارەی دڵتەوە بۆم بدوێ "



نوسینی
الآء صفوان الدهنه
وەرگێڕانی
صفیە محمد پاڵانی

# " لەبارەی دڵتەوە بۆم بدوێ "

## الآء صفوان الدهنە

## وەرگێڕانی
## صفیە محمد پاڵانی

## پێشەکی نوسەر:

**بە ناوی خودای میهرەبان**

**خەونەکانمان وەك هەورێکە ..**
**وەکو خەونێکی پەمەیی هەمویان کەڵەکە دەکەن بۆ ئەوەی ببنە هەورێك لە ئاسمانی ئاواتە داپۆشراوەکانمان .. چاوەڕێی بارینی دەکەین بۆ سەر زەوی بۆ کردنەوی ئەوی هەیە لە دڵخۆشی و بەختەوەری بۆمان .. تا خودا مۆڵەتی بەدیهێنانی بدات و چاومان پێی دڵخۆش بێت ..**
**ئەو خەون و ئاواتانەی لە دڵتدایە، تەنها خودایەکی هەیە ...**
**ڕەنگە دڵت ماندوو بێت، و خەم و دابڕان ماندووی کردبێت، کەس نازانێت دڵت چەند خەونی لە گۆڕ ناوە، و چەند فرمێسکی ڕشتووە بە تەنها ..!.**
**وەرە و لە بارەی دڵتەوە بۆم بدوێ، لەسەر ئەو خەون و هیوانەی کە دڵت لە خۆی گرتووە، وە لەسەر گوومان باش بردن بە ئافرێنەرەکەت (خالقەکەت) ..**
**ئەوە دڵتە، کەس هەستی پێ ناکات و نازانێت چی لە ناوییدایە جگە لەوەی پێی کردووە! ..**
**دڵت لە هەڵوەستە و ئەزموونەکان فێردەبێت، وە لەو کەسانەی دەیناسیت! ..**
**سوپاس و پێزانیم هەیە بۆ دڵی دایك و باوکم، وە هەر کەسێك کە لەم ڕێگایەدا هانای داوم بۆ بەدیهێنانی خەونەکەم؛ نموونەی هاوڕێکانم: هودا سوڵتان و زەینەب و قەمەر،**
**بە ئاواتی بە دیهێنانی خەونەکانتان بەو جۆرەی کە خۆتان هیوای بۆ دەخوازن و حەزتان لێیە ..**

**الآء صفوان الدهنه**

**١٤٣٧/٤/١٦هـ**

# ووتەی وەرگێڕ:

سوپاس بۆ خودای مەزن کە توانیم یەکێك لە خەونەکانم بەدی بهێنم

زۆر سپاسی نوسەری ئەم کتێبە بەرێز خاتوون ئالا دەکەم کە پشتگیری کردم و یارمەتیدام لە بڵاوکردنەوەی، وە سوپاسی ماریای هاوڕێم و هەموو ئەو کەسانە دەکەم کە پاڵپشتوو و هاوکارم بوون

ئەمە یەکەمین کتێبە کە وەریبگێڕم، بۆیە داواتان لێدەکەم بە دڵ فراوانیەوە لە هەڵەکانی ئەم کتێبە خۆش بن

صفیه محمد

بەرەکەتەکانی خودا*

لە چاکی سوپاسگوزاری بۆ بەرەکەتەکانی خودا ئەوەیە کە ڕەحم بەو کەسانە بکەین کە لەدەستیان داوە بەوەی کە لە بەرامبەر ئەواندا لە بارەیانەوە نەدوێین وگاڵتەیان پێ نەکەین.

وەکو ئەوە وایە باسی سۆزی دایك و باوکت بکەیت بەرامبەر بەو کەسانەی کە دایک و باوکیان بەهۆی ڕووداوێک لە ڕووداوەکان لە دەستداوە ، تۆ هەست بە مەودای ئازارو ناڕاحەتیەکانیان ناکەیت، چونکە لەو بارودۆخەی ئەواندا نەژیاوی

وەکو ئەوەی ئافرەتێک لەبارەی منداڵەکەیەوە بدوێ بەرامبەر بە کەسێک کە بێبەش کراوە لەم خەڵاتە ..

وەکو ئەوەی دەوڵەمەندێک لەبارەی زۆری و فراوانی سامانەکەیەوە بدوێ بەرمبەر هەژارێکی بێبەش ..

دڵانێک هەن کە هەمیشە خۆزگە و ئاواتێکی زۆریان هەیە هەموو کاتێك لە خودا دەپاڕێنەوە ، خوایە گیان دڵخۆشی و ڕازی بوونمان لە ژیاندا پێ ببەخشە ..

خەڵکانێک هەن خودا بەرەکەتێکی زۆری بەسەردا ڕژاندون ، بەڵام هەستی پێ ناکەن ، وە سەرەڕای ئەوەش ئەیانبینین زیاتر خەمبارن ، لە هەموو بارودۆخێکدا کە بۆیان دروست دەبێت وا بیردەکەنەوە کە ئەوە تووشی ئازار و دڵتەنگیان دەکات .. وە یانیش تووشی قەلەقیان دەکات ..
بەڵام لە ڕاستیدا دەبینین ئەو شتانەی کە بەهۆیانەوە تووشی قەلەقی و دڵتەنگی دەبن شتانێکی بێ بەهان و شایەنی ئەو هەموو دڵتەنگیە نیە .،

دڵخۆشبوونت هەر بە دەست خۆتە ، وە ئەوە بە تەنها بڕیاری تۆیە ..

* * *

ئافرەتێکی سفوور دەبینێ لە دڵی خۆیدا دەڵێت : وای لە بێشەرمیەکەی چۆن بەم شێوە جلوبەرگە لەناو خەڵکدا هەتووچۆ دەکات و تێدەپەڕێت ..

ئایا وا باشتر نیە نکۆڵی لە خراپە بکات و لە ناخیدا سوپاسی خودا بکات بەوی کە خودا ئەوی پاراستووە و داپپۆشیووە !، یان بەلایەنی کەمەوە دوعای هیدایەتی بۆ بکات .!

لە ڕێگادا دەبیستێ کەسێك لە ناو ئوتۆمبێلەکەیدا دەنگی گۆرانیەکەی بەرزکردۆتەوە ، وە خەڵکی دەوروبەری بێزار دەکات، لە دڵی خۆیدا دەڵێ : خودا ناڕەحەتی بکات وەك چۆن ئێمەی ناڕەحەت کرد .

ئایا وا باشتر نیە ئاماژەی بۆ بکات بەوەی دەنگەکە نزم بکاتەوە !، یان بە لایەنی کەمەوە دوعای هیدایەتی بۆ بکات !

کەسێکی قەڵەو دەبینێ لە دڵی خۆیدا دەڵێ : (خودا لەسەر ژیانی سزای داوە) ، وە دەڵێ : جەستەی من لە جەستەی ئەو باشترە ، وە بە لووت بەرزیەوە تێدەپەڕێت . بەڵام لەوانەیە ئەو کەسە هەموو کارێکی ئەستەمی کردبێت لە پێناو ئەوەی کێشی خۆی دابەزێنێ ، وە یان دەرمانێکی زۆریشی بەکارهێنابێت .. پێویست بوو لەسەری یەکەم جار سوپاسگوزاری خودا بکات بەوەی کە تەندروستیەکی باشی پێ بەخشیووە ، وە داوای یارمەتی بۆ بکات لەلایەی خودا، نەك لەبەر ئەوەی خۆشی ئەوێت بەڵکو لەبەر مرۆڤایەتی وە لە جیاتی ئەوەی خۆی بە گەورە بزانێ ..

لە ڕاستیدا ئێمە لە ناخماندا زۆر (بەخیلین) ئەوە لە بیر دەکەین کە لەلای ڕاست و چەپماندا فریشتە هەیە ، وە هەموو شتێك تۆمار دەکەن،
خودای گەورە ئاگای لەو گفتووگۆیانەیە کە لە خەیاڵماندایە ، دەکرێت ڕۆژگار هەڵسوڕێت و ئێمە تووشی نارەحەتی و پەرێشانی بین ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا پێداگریین لەسەر ئەوەی بەرەکەتەکانی خودا لەبیر بکەین ..

خودا ئێمەی پاراستووە وە پۆشتەی کردوین ، وە گوێیەکانمانی لە گۆرانی پاراستووە و تەندروستیەکی باشی پێبەخشیووین ، دەبێت سوپاسی خودا بکەین بۆ ئەو بەرەکەتانەی کە پێشکەشمانی کردووە و هەستی پی دەکەین ..

تاوەکو نەگەین بەو ڕێگایەی کە هەتا لە دوای لە دەستدانیان دەرك بە بەهای شتەکان نەکەین ..

بێزار دەبیت لە زۆر خوێندن و تاقیکردنەوە وە پرسیارە قورسەکان .. گوێی پێ مەدە ، سوپاسی خودا بکە ، زۆر کەس هەن لەم نیعمەتە بێبەش بوونە و خوێندنیان تەواو نەکردووە ، هەمیشە دەخوازن هەر شتێك هەبێت فێری ببن تاوەکو ڕووبەڕووی نەزانینیان ببنەوە ..

بێزار دەبیت لە زوو لەخەو هەستان بۆ چوونە سەر کار ، گوێی پێ مەدە زۆر کەس هەن بێکارن و خۆزگە دەخوازن هەلێکیان دەستکەوێ بۆ بەدەستهێنانی بژێوی ژیانیان بە حەڵاڵی ..

بێزار دەبیت لە بەردەوامی بۆڵە بۆڵی دایك و باوكت لەسەر ڕەفتار و هەڵسوكەوتەكانت ؟، گوێی پێ مەدە زۆر كەس هەن دایك و باوكیان لە دەستداوە ، هەموو ئاواتیان ئەوەیە دایك و باوكیان بگەڕێتەوە گەر هاوار و بۆڵە بۆڵشیان بەسەردا بكرێ ..

جەستەت بە دڵ نیە ؟ یا ڕەنگی پێستت!؟

سوپاسی خودا بكە كەسانێک هەن خۆزگە دەخوازن لەسەر پێیەكانی خۆیان بوەستن وبتوانن پیاسەیەک بكەن ، یان هەندێک هەن خۆزگە دەخوازن كە بتوانن بە دەستەكانی خۆیان ، دەست لە قورئانی پیرۆز بدەن ، یان بتوانن یارییەكی وەرزشی بكەن ، وە یان خۆزگە دەخوازن جەستەیان لەو نەخۆشیە چاک بێتەوە كە تووشیان بووە.

بێزار دەبیت لە گەرمای بە تینی خۆر و تیشكەكانی .. گوێ پێ مەدە هەندێک كەس هەن چەندین ساڵە لە سووچێكی تاریكدان و ئاواتیانە تیشكی خۆر ببینن .

ئێمە لە ناز و نیعمەتێكی زۆرین و هەستی پێ ناكەین ، دڵخۆشیمان لەناو دەستەكانی خۆماندایە و پێشی نازانین ، دڵخۆشبوونمان واتا ڕازی بوونە بە ژیانمان ، ئەوەی ڕازی بێت بە ژیانی خۆی بەو پەڕی ئاسودەیی و دڵنیایەوە دەژی

ئەو ناز و نیعمەتانەی بەسەر تۆ باریون و ئێستا هی تۆن ، خۆزگەو ئاواتی كەسانێكی ترن ..

* * *

**وا ڕاهاتووین سوپاسی  مرۆڤەکان بکەین کاتێك چاکەیەکمان لەگەڵ دەکەن ئەگەر ئەو کەسەش منداڵێک بێت ،**

**بەڵام هەندێکی کەمیان هەن کە سوپاسی خودا دەکەن لەسەر ئەو ناز و نیعمەتە بێشومارەی کە خودا پێی بە خشیون ،**

**ئێمە بێ باکین لە سوپاسکردنی خودا ، ئەو خودایەی زیاتر لە ئەوانەی کە ئەمانەوێ پێمان دەبەخشێت**

**وە ڕزگارمان دەکات لەو کارەساتە ئاشکرایانەی کە ئێمە وا بیرمان دەکردەوە کە هەرگیز لێی دەرناچین ، ئایا شایەنی سوپاس کردن نیە "سبحانە" پاکی و بێگەردی بۆ خودا ، دانمان بە کەم و کورتی خۆماندا نا ..**

**(اللهم ما أصبح / ما أمسى بنعمة أو بأحد من خلقك فمنك وحدك**

**لا شريك لك فلك الحمد و لك شكر )**

**هەر کەسێك ئەم زیکرە لە ئێواران یان لە بەیانیان بخوێنێت
ئەوا مافی سوپاسگوزاری ئەو شەوە یان ئەو ڕۆژەی داوە.**

**ئایا لە دڵەوە سوپاسی خودا دەکەیت ؟، یان پێویستت بە کەسێکە بیرت بهێنێتەوە کە سوپاسی خودا بکەیت ؟**

**زۆرجار نیگەران دەبووم بەهۆی ڕەنگی پێستم کە (ئەسمەرێکی تاریکە) ، کاتێک سێری ئافرەتێکی سپیم بکردایە ، هیوام دەخواست کە وەك ئەوبم ، من لە هیچم کەم نەبوو جگە لە نەبوونی پێستێکی سپی ، وە هیچ ڕێگایەك نەما تاقینەکەمەوە بۆ ئەوەی ببمە خاوەن پێستێکی سپی ، پاودەرێکی زۆرم بەکاردەهێنا تا بگەم بەو شێوەیەی خۆم ئەمویست .**

**وە بە چەند شێوەیەك خودای گەورە چەندین نامەی بۆ ناردم :**

**کەسێکم بینی کە ڕەنگی پێستی سپی بوو بەڵام پەڵەیەکی گەورە لەسەر دەمووچاوی بوو ، لە دڵی خۆمدا ووتم : چی سوودێکی هەیە یان ئەسڵەن چی جوانیەکی هەیە گەر من پێستم سپی بوایە و ئەم پەڵەیەم بە دەمووچاو بایە ؟، لە دڵی خۆمدا ووتم سوپاس بۆ خودا ، خودا باشی بۆ بکات ، من لە نیعمەتدام با ڕەنگی پێستیشم هەر ڕەنگێك بێت ..**

**کاتێك ئافرەتێکم بینی کە دەینالاَند لەبەر نەخۆشی (ڤیلیتیگۆ) ، وە ڕەنگی جەستەی بەهۆی نەخۆشیەکەیەوە بۆ (کاڵ و تۆخ) گۆڕابوو .. سێرێکی پێستی خۆم کرد و لە ناخی خۆمدا ووتم : خودا شیفای بدات ، من گەر لە جێگای ئەو بوومایە خۆزگەم دەخواست کە پێستێکی وەکو پێستێ خۆمم هەبوایە بەبێ بوونی (بەڵەکی پێستی) ..**

**بۆیە هەمیشە ئەم قسانەم لە پێش خۆمدا دووبارە دەکردەوە ، من جوانم ، جوانم بە ڕۆحم ، بە وتەکانم ، بە ئاکار و ڕەوشتم ، نەك بەهۆی شێوەمەوە نەك بەهۆی سپی بوونی پێستم ، وە فێری ئەوە بووم کە هەر کەسێك ڕازیبێت بە بەشی خۆی و چارەنووسی ئەوا بە ئاسوودەیی دەژی ..**

**با سوپاسی خودا بکەین لە جیاتی ئەوەی ئاوات بە شتانێکی باشتر لەوەی کە هەمانە بخوازین ، خودای گەورە باشتر لەوەی کە ئاواتی بۆ دەخوازین بە ڕێگایەکی شایستە بۆی فەراهەم کردوین ..**

***     *     ***

**گریان نیعمەتە، وافێربووم کە نەهێڵم بەرامبەر هیچ کەسێك فرێسکەکانم بێتە خوارەوە ، بەتایبەتی بەرامبەر هاوڕێیەکانم،**
**زۆر کەس پێیان وایە گریان بەشێکە لە لاوازییەکانی مرۆڤ ، وە ئەوە بە تەواوی پێچەوانەکەیەتی .. چونکە گریان ئەوە نیشان دەدات کە چی هەستێکی ڕاستگۆیانەی مرۆڤانەت لە دڵتدایە . .**
**ئاگام لە فرمێسکەکانم دەبێت نەك لەبەر ئەوەی بترسم کە بەهۆی فرمێسکاکانمەوە خەڵکی لە هەستەکانم تێبگەن ؛ نا بەڵکو تاوەکو کەس لە شەرمەزاریدا دڵم نەڕووشنێ و پێم پڵێ : تۆ ڕۆژێك لە بەردەممدا گریای .. گریان خاسیەتی باشەکانە ..**

## Vilitigo

**یان بەڵەکی پێستی : بەهۆی ئەوەی کە خانەی میلانۆسایت لەناو ئەو بەشەی پێست نامێنێت ، وادەکات ئەو بەشەی پێست سپی یان شیری دەربکەوێ ، واتە پێست بەشێکی دەبێت بە قاوەی و بەشێکیشی دەبێت بە سپی .**

**هەندێك كەس بە دزیەوە لە ترسی خۆشەویستانیان دەگرین ، هەر لە پێناو ئەوانیشدا پێدەكەنن ، هیچ شتێكیان لەلادا گرینگ نیە جگە لە دڵخۆشكردنیان ، وە هیچ كەسێكیش نازانێ كە چی لە ناخی ئەوانەدا هەیە جگە لە خودا خۆی نەبێ**

**وە ئیتر ڕاهاتووم كە فرمێسكەكانم كەم بكەمەوە بۆ ئەو كەسانەی كە جێمدەهێڵن چونكە ئەوەی شایەنی فرمێسكەكانی من بێت هەرگیز ڕێگا نادات بگریم ..**

* * *

دوو ڕۆح لە جەستەیەکدا*

چەند نامەیەك بۆ هاوڕێیەك:

( 1 )

هاوڕێکەم دەمبینی هەڵەیەك دەکەم ، پێم بڵێ و ئامۆژگاریم بکە ، بێدەنگ مەبە بۆ ئەوەی خۆشەویستی من بە دەستبهێنی ، ئەمە تەنها دونیایەکە بەهەشت گرانبها ترە ، ڕاستە کەمێک ئازار دەچێژم بەڵام دواتر بیردەکەمەوە و تۆ بەڕاست دەزانم ، وە هەستیش بەوە دەکەم کە ئەترسی بچمە ناو ئاگری دۆزەخەوە ..

( 2 )

ئەی هاوڕێ کاتێك دەمبینی گوێ لە گۆرانی دەگرم وەرە و بە هێواشی بیرم بخەرەوە کە ئەمە کارێکی حەرامە ( واتا قەدەغەیە بۆ کەسی موسڵمان ) ، وە پێم بڵێ کە بەهەشت بەنرخ ترە ، خۆت مەخەرە ناو بیری هەواو و هەوەسی دونیایی چونکە دەبێتە هۆی مانەوەی خەم و خەفەت لە دڵتدا .

هەموو بەیانیەك بیرم بخەرەوە کە بۆ هەموو جومگەکانی جەستەم خێر بکەم ، ئەوەش بێگومان بە کردنی نوێژی چێشتنگاو (الضحى) ، وە شەوەکەشم کۆتایی پێ بهێنم بە نوێژی وتر .. لەگەڵ خۆت بمبە بۆ بەهەشت هاوڕێ ..

( 3 )

دڵت بەنرخترین شتە کە هەتە ، بەهۆی پەیوەندییە کاتیەکانەوە پیسی مەکە ، هەر کەسێک بیەوێت تۆ ببیت بە هاوسەرێکی باش بۆی و ماڵەکەی بۆ بپارێزی ، دێت لە دەرگاری ماڵی باوکت دەدات بە حەڵاڵی ، وە دڵنیبە هەموو دڵێک وەکو دڵی باوکت نیە .

(4)

ئامانجێک لە ژیانتدا دەستنیشان بکە ، مەکەوە ناوی ژاوەژاوی و
سەرلێشێواویدا و هەموو تەمەنت تێپەڕبێت و هیچ دەسکەوتێ لە ژیانتدا
مسۆگەر نەکەی، وە ئەگەر ئەو دەستکەوتەش شتێکی سادە بێت ، پەنجەمۆرت
لە دونیادا بەجێ بهێڵە بۆ ئەوەی وەك پاشماوەیەك بمێنێتەوە لە دوای خۆت ..

(5)

پێبکەنە ، پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی کە زەردەخەنەی کردووە بە
پەرەستش و عیبادەتێك کە پاداشتی لە سەرە ، پاداشتیش لە خودا وەربگرن ،
زەردەخەنە بکە بەرامبەر هەر کەسێک کە دەیناسی و هەرکەسێکیش کە
نایناسی ، بە زەردەخەنەکەت دڵی ئەوان بە دەست دێنی ،
هەمیشە سڵاو لە کەسانی دەوروبەرت بکە ، چونکە بە سڵاوکردنەکەت
پاداشتێکی زۆرت دەستدەکەوێ ..

(6)

خودای گەورە لە هەموو شوێنێك چاودێر و بینەرتە ، ئەو وێنانەی کە بڵاوی
دەکەیتەوە لە ناو تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان لە ئەنتەرنێت ئەوە بەشێکە لە
کەسایەتیت ، دوور بکەوە لەو وێنانەی کە دەبنە هۆی توڕە بوونی خودا ،
چونکە چاویش زینا ئەکات زیناکەشی نەزەرکردنە ، وە هەمیشە لەبیرت بێت
هەر کەسێك وازی لەشتێك هێنا لەبەر خودا ، خودا پاداشتی بە چاکتر دەداتەوە .
سەیرکردنی وێنەی باوەش و ماچکردن ئاماژە بە ڕۆمانسی بوونت ناکەن ،
بەڵکو ئاماژە بۆ بێ شەرمی و بێ باکی بوونت لە خودا دەکەن ..
خودا نیعمەتی بینینی پێ بەخشیووی ، بۆیە چاوەکانت بپارێزە لە هەر شتێک کە
دەبنە هۆی توڕە بوونی خودا ..

**( 7 )**

**با هەمووان پێکەوە هەموو ڕۆژێك قورئانی پیرۆز بخوێنینەوە ، هەمووان پێکەوە بە شێوەیەکی ویژدانی بەژداربین ، گەر جەستەمان تووشی هەر ناڕەحەتیەك بوو ، ئەوا قورئانی پیرۆز ئارامی و شیفا و دڵنیایە ، وە پاککەرەوەی نیگەرانی و خەمەکانمانە ، وە خوێنەری قورئان گلەیی ناکات لە خەم و خەفەت و دڵتەنگیەکەی ..**

**( 8 )**

**ئەگەر شتێکت لەبارەی منەوە بیست ، وەرە و قسە لەگەڵ من بکە ، باوەڕ بە هەموو شتێك مەکە کە بە گوێیەکانت دەیانبیستیت ، هەندێک کەس بەهرەی تێکدانی دڵیان هەیە دڵی ئەو کەسانەی کە پڕن لە خۆشەویستی بۆ خەڵکانی تر، ئەگەر قسەکانیشیان ڕاست بوو ، ئەوا لە غیابی مندا بەرگریم لێ بکە هاوڕێ ..**

**( 9 )**

**ئێمە لەسەر خۆشەویستی خودا و دۆستایەتیمان لەگەڵ خودا و کارەکانمان یەکمان بینی ، وە هەتا پەیوەندیەکانمان لە پێناو خودا بێت ، ئەوا هیچ شتێک زیان بە پەیوەندیەکەمان ناگەیەنێ ، بە پشتیووانی خودا ..**

**غەریبی و بێگانەیی بوونی نیە ، ئەم زەوییە بە هەموو شتێکیەوە موڵکی ئێمە نیە ، وە نە ئەم ئاسمانەش ئاسمانی ئێمەیە ، ماڵ و جێگەی ئێمە بەهەشتە ، لەوێدا خۆشەویستان لە دیداری هەتا هەتاییدا لەگەڵ ڕەحمەتی خودا کۆدەبنەوە کە هەرگیز تامی دابڕان و مردن و لەدەستان ناکەن ..**

* * *

**بۆم باس دەکەیت و دەڵێیت : من و هاوڕێکەم پێکەوە گوێمان لەگۆرانی دەگرد ، وە ڕۆژێکیان بڕیارماندا تۆبە بکەین لە گوێگرتن لە گۆرانی وە گوێیەکانمان بپارێزین لەو شتانەی کە خودا حەرامی کردووە ، لە دڵی خۆماندا بەڵێنماندا ڕاستگۆبین لەگەڵ خودا ، دوای چەند ڕۆژێك هاوڕێکەم پێی ڕاگەیاندم کە دووبارە گوێ لە گۆرانی دەگرێتەوە . چارەسەرێکم دەوێت ، چۆن وا لە هاوڕێکەم بکەم کە واز لە گوێگرتن لە گۆرانی بێنیت ؟.**

**منیش پێم ڕاگەیاند ئامۆژگاری بکات کە بەردەوام بێت لەسەر نوێژەکانی ، چونکە نوێژ کۆتایی بە بێ هودەیی و خراپەیی دەهێنێت . وە هەمیشە بەردەوام بێت لە ئامۆژگاریکردنی و بەهەشتی بەبیر بهێنێتەوە ، وە بەوەی کە خودای گەورە بە باشتر قەرەبووی دەکاتەوە ئەگەر هاتوو واز لە گوێگرتن لە گۆرانی بهێنێت لەبەر خودا ، وە بێگومان هەر کەسێك واز لە شتێک بهێنێت لەبەر خودا ، خودا باشتری پێ دەبەخشێت ..**

**وە دواتر پرسیاری حاڵ و باڵی و خوێندنەکەیم لێکرد ، وامزانی بەم پرسیارە زیاتر هۆشی ئەکەوێتە سەر من ، بەڵام بەپەلە باسی حاڵ و باڵی ئەوی بۆ کردم و یەکسەر ووتی : دەمەوێت لە تاوانەکانی کەم بکەمەوە ، نامەوێت بچێتە ناو دۆزەخەوە ، یان جەستەی ئازار بدرێ لەبەر " گۆرانی " !**

**پێم ڕاگەیاند چاکەی بۆ بکات لە پشت نەبینراوەکان (بە نەهێنی) ، وە دوعای بۆ بکات..**

**ئەوە مانای هاوڕێیەتی باشە ، هەر کەسێکمان خۆشویست با لە پێناو خودا بێت ، بۆ ئەوەی دڵمان هەموو کاتێ یادیان بکات ، وە ئەوانیش دەستەکانمان بگرن و بەرەو بەهەشت ڕامانبکێشن ..**

* * *

**ئەگەر ئەو هاوڕێیەی کە لە قوڵای دڵت خۆشتدەویً وازی لیً هێنای خەمبار مەبە .. فرمێسکەکانت لەسەر ڕووخسارە جوانەکەت بسڕەوە ، چونکە بەم جێ هێشتنەی هەلێکی باش و بۆشایەکی نویً دەڕەخسێنیً بۆکەسانی تر بۆ ئەوەی بێنە ناو ژیانمانەوە ..**

**ئەمە شتێکی جوانە .. ڕەنگە ئەم کەسە نوێیە لە هەگبەییدا بڕێکی زۆر لە تایبەندمەندی جوانی هەڵگرتبیً کە تۆ بە دەواییدا دەگەڕای و نەدۆزیەوە لەو هاوڕێیەی کە بەجێی هێشتی ..**

**لە کۆتاییدا ژیان هەر بەردەوام دەبێت ، وە ژیان بۆ هیچ کەسێك ناوەستیً ، هەر شتێك کە ڕوودەدات چاکەی تێدایە بۆ ئێمە ، بەڵام خۆمان پەلە دەکەین ، وە پێش ئەو شتانە دەکەوین کە شاراوەن بۆ ئێمە و لە حیکمەتەکانی خودان ، دوای ئەوەی ئەو کەسانە دڵی ئێمەیان شکاند و ئازاریان داین ، لەگەڵ ئەوەشدا ئاسۆیەکی نوێیان بۆ ئێمە کردەوە ..**

*** * ***

**ئەو هاوڕێیەی کە لە خراپترین ساتەکانی ژیانم لەگەڵمدا دەبێت .. ئەو هاوڕێیەیە شایەنی هەموو واتاکانی خۆشەویستیە لە قوڵای دڵەوە ، وە ئەوە ئەو کەسەیە کە هەمیشە بە پاکی لە یادەوەریەکانمدا دەمێنێتەوە ..**

*** * ***

**ئەگەر چارەنووس تۆ و ئەو هاوڕێیەی کە خۆشتدەویً لێك جیاکردەوە ، ئەوە بزانە کە ڕێگایەکی نویً چاوەڕێتە ، وە خودا گیانێکت پیً دەبەخشیت کە بەهێز و پتەوت بکات .**

**یادەوەریەکانتان لەبیر مەکە ، هەمیشە بە چاکەوە باسی بکە ، جیابوونەوە مانای ئەوە نیە کە ئێمە سەرەڕای دووریەکانمان یادەوەرییەکان لەبیربکەن ، ئەگەر کەسێک باسی هاڕێیەتی کرد ، ئەوە تۆش ئەو هاوڕێیەت بەژدار پێبکە ، بەزەردەخەنەوە باسی یەکەم بینینتان بکە ، وە باسی ئەوە بکە کە چەند بیری ئەو و یادەوەریەکانی ئەو دەکەیت کە هەرگیز لەبیرناکرێن، وە باسی ئەوەش بکە کە یارمەتیداوی لە کاری چاکە، کاتێک ئەو هاوڕێیەت دەزانێت کە تۆ چۆن لە غیابی ئەودا بە باشی باسی دەکەیت لەبەرامبەر دەوروبەرکەتدا، ئەو کاتە بەوە**

دەزانێت کە چەند دڵسۆزی بۆی، وە دەزانێت هێشتا لە لاپەڕەکانی ژیاندا ماوەتەوە. دڵت بکەرەوە، ڕۆژێک دێتەوە و لە دەرگەکانی دڵت بدات .. هەمیشە ئەو ڕۆژگارە جوانانەت لە یادبێت کە پێکەوە بەسرتان برد، وە دڵخۆشی بۆ زیاتکردوی لەویادەوەریانەی کە نوسیوتەتەوە. ژیان پڕە لە ڕووداو و هەڵوەستە ئەگە لە بارێکدا بوەستین ئەوا ناتوانین دریژە بە گەشتی ژیان بدەین و ئەم سەفەرەمان سەخت و دژوار و بێ کۆتا دەبێت ..

وە بۆ ئەوانەی کە زۆر جێماندەهێڵن، پێویستە فرمێسکەکانمان بۆ لە دەستدانیان کەم بکەینەو، چونکە بە تەنها خودا بۆ هەمیشە لەگەڵمان دەمێنێتەوە ..

*      *      *

**نیمچە هاوڕێ***

**ئەوەی من دڵتەنگ دەکات ئەوەیە کە هەندێک مرۆڤ کەسانێک وەك هاوڕێ پۆلێن دەکەن ..**
**ئەم هاوڕێیە قسەی دروستکراو و درۆیانە بە خەڵکی دەڵێت سەبارەت بە هاوڕێکەی خۆی بۆ بەدەستهێنانی متمانەی کەسانی دەوروبەری !.**
**ئەم هاوڕێیە هانی هاوڕێکەی تری دەدات بۆ خراپەکاری !.**
**ئەم هاوڕێیەش زەردەخەنەی بەرژەوەندی دەکات نەك خۆشەویستی !.**
**زۆرن ئەوانەی کە لێیانەوە فێردەبین و دەڕۆن ، تەنانەت هاوڕێش بەرەکەتێکە لە لایەن خوداوە !. هەندێکیان نیعمەتن وەکو ئاوێنە خۆمانیان تیا دەبینینەوە، هەندێکیشیان هەر هەست بە بوون و نەبوونیان ناکەین، وە هیچ پێویستمان بەو جۆرە کەسانە نیە !.ئێمە تەنها پێویستمان بە نیو هاوڕێ و نیو خۆشەویستی دڵسۆز هەیە!..**

*   *   *

به خەون*

خەونێک .. کە دەتەوێت بەدیبێت، دڵخۆش بوونت دەبەستیتەوە بە بەدیهێنانی ئەو خەونە ، وە زۆر لە خودا نزیك دەبیتەوە و پابەند دەبیت بە نوێژەکانت لە کاتی خۆیدا ، وە شەو نوێژ و نوێژی وتر و نوێژی چێشتنگاو بە بەردەوامی دەکەیت .. دەبیتە خوێنەرێکی زۆری قورئان، زۆر داوای [استغفار] لێخۆشبوون دەکەیت لە خودا، وە بە بەردەوام داوا لە خودا دەکەیت خەونەکانت بۆ بکاتە ڕاستی .. خوداش بە ڕەحمی خۆیەوە ئەوەی تۆ دەتەوێت پێت دەبەخشێت، وخەونەکەت بۆ دەهێنێتە دی.

دوای ئەوە .. ئەو گوێڕایەڵیەی کە بۆ خودا هەتبوو کەم دەبێتەوە، باوەڕ بەخۆ و لووت بەرز دەبیت، و زۆر دەگەڕێیتەوە دواوە لە پەرستشکانت ..
دڵت پاکبکەرەوە و بەخۆشەویستیەوە خودا بپەرستە ، لێی دوورمەکەوە چونکە ئەوەی ویستت بۆی هێنایتە دی، بەڵکو زیاتر و زیاتر سوپاسی خودا بکە، دڵت گەر بیەوێت ئەو بەرەکەت و سەرکەوتنانە سنورداربکات کە خودا پێ بەخشیووی ، ناتوانێت سنوورداریان بکات !.

* * *

بۆت قورسە هەموو مانگێک قورئان خەتم بکەیت .. کەچی لە مانگی ڕەمەزان زیاتر لە جارێک هەمووی خەتم دەکەی !.
ناچارت دەکەن بۆ تاقیکردنەوەکەی سبەینێ سەد لاپەڕە بخوێنی، بۆ تۆش زۆر زەحمەت دەبێت ، داوا لە مامۆستاکەت دەکەی ژمارەی لاپەڕەکان کەم بکاتەوە .. کەچی لە تاقیکردەوەی کۆتاییدا تەنها لە یەك شەودا زیاتر لە سەد لاپەڕە دەخوێنیت !.
هەوڵدەدەیت منداڵەکەت فێری شتێکی نوێ بکەی، وە بێزار دەبیت لە زۆر دووبارە کردنەوەی ئەو شتانەی کە فێری منداڵەکەت دەکەیت، کەچی بەجێیدەهێڵی بەبێ ئەوەی هەوڵبدەی شێوازی فێرکردنەکەت بگۆڕیت !.
بەڵام گەر بە چەند شێوازێک بۆی ڕوونبکەیتەوە و فێری بکەیت ئەوە دەبینیت بەبێ بێزاربوون زیاتر و بەهێزتر فێردەبێت ! .
دایکی بەردەوام پێداگری لەسەر دەکات بەوەی کە دەبێت کە ڕێجیم بکات بۆ ئەوەی لاواز بێتەوە، ڕێجیم دەکات بەڵام هەر کە دایکی دیارنەما یکسەر دەستدەکات بە خواردن !.
کەچی لە دوای مارەکردنەکەی خۆی بە گرینگیەوە دەست بە ڕێجیم دەکات، وە پێش مانگێک لە ئاهەنگی هاوسەرگیریەکەی زۆرلاواز دەبێتەوە ! .
هیچ جیاوازیەك بوونی نیە هاوڕێ مەگەر بە ویست و ئیرادەی خوت نەبێت !.
ئەگەر ویستت شتێك بکەیت و پشتت بە خودا بەست ئەوا هیچ شتێک ناتوانێ شکستت پێ بێنێت ، وە هیچ کاتێکیش کەس ناتوانێ ڕاتبگرێ !.
ئەگەر ویستت هەبوو هیچ شتێك شکستت پێ ناهێنێ !.
لە ژیاندا ئەو کەسانەی کە بەهێزن و ئازان و بڕوایان بە تواناکانی خۆیانە، ئەو کەسانەن کە هەمیشە براوەن !. وە دڵت گەر ویستی شتێکی هەبوو هیچ شتێك ناتوانێ بیوەستێنێ !.

* * *

**ئەو بڕیارانەی کە ئێمە دەیاندەین بەو شێوە ئاسان نیە کە هەندێك وا بیردەکەنەوە، لەبەر ئەوەی کاتێك ئیمە بڕیارێك دەدەین و جێبەجێیدەکەین ئەم بڕیارە لە هەموو قۆناغەکانی ژیانماندا کاریگەری لەسەرمان دەبێت لە خوێندن و هاوسەرگیری و هتد ..**

**بۆیە لەسەر مرۆڤەکانە کە پەلە نەکەن لە بڕیاردان بۆ ئەوەی پەشیمانی بەدوادا نەیەت، بەتایبەت لە بڕیارە چارەنووسازەکان، وە بۆ بڕیارەکانمان وێنەی دوو ڕێگا دەکێشین؛ یەکێکیان ئەرێنی، و ئەوەی تریان نەرێنی، وە دەیهێنینە پێش چاوی خۆمان کە چی روودەدات لە کۆتایی هەموو چوارڕێیانێکی ڕێگاکەدا ..**

**بۆیە بەهێز و توند و تۆڵ دەبین لەکاتی بڕیارەکان، وە لە کۆی شکست و پەشیمانیەکان دوور دەکەوینەوە؛ وە لەسەر مرۆڤ پێویستە کە لە هەموو کارەکانی ژیانیدا ڕاوێژ بە خودای باڵادەست بکات، وە زۆر کەسە هەن ڕاوێژکردن لەگەڵ خودای خۆیان لەبیرکردووە و پشتگوێیان خستووە ..**

" له جابرەوە سەلامی خوای لێبێت دەفەرمووێت: پێغەمەر (د.خ) فێری نوێژی (استخارە)ی دەکردین بۆ هەموو شتێك، هەروەك چۆن فێری سورەتێکی قورئانی دەکردین دەیفەرموو : ئەگەر کەسێك لە ئێوە تووشی دوودڵی ودڵتەنگیەك هات با دوو رکعات نوێژ بکات جگە لە نوێژە فەرزیەکەی وە بڵێت :

((اللَّهُمَّ إِنِي أسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ ، وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيمِ ، فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلَا أَقْدِرُ ، وَتَعْلَمُ وَلَا أَعْلَمُ وَأَنْتَ عَّلامُ الْغُيُوبِ ، اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الأَمْرَ (لێرە ناوی ئەو کارە ئەهێنی کە بە نیازیت بیکەیت) خَيْرُلِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَ عَاقِبَةِ أَمْري فَاقْدُرْهُ لِي ويَسَّرْهُ لِي ، ثُمَّ بَارِكْ لِي فِيهِ ، اللَّهُمَّ وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا اَلأَمْرَ (لێرە ناوی ئەو کارە ئەهێنی کە بەنیازی بیکەیت) شَرُّلِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي فَاصْرِفْهُ عَنَّي وصْرِفْنِي عَنْهُ ، وَاقْدُرْلِي الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ ، ثُمَّ أرضِنِي بِهِ .))(رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ) .

واتا: ((خوایە گیان پرس و ڕای کاروباری ژیانی خۆم بە تۆ دەسپێرم تۆ تواناو دەسەڵات و زانیاریت لەسەر هەموو شتێك هەیە، داوات لێدەکەم بە گەورەی خۆت کە دەسەڵات و توانا و پەنهانیەکان لای تۆیە ئەو کارەی من بەنیاز م بیکەم (ناوی کارەکەت بێنە) ئەگەر خێری دونیا و دواڕۆژی تێدایە بۆم ئەوا بۆم ئاسان بکەیت و لەبەرچاوم جوانی بکەیت و لەبەردڵم شیرینی بکەیت، ئەگەر خێری دونیا و دواڕۆژی تێدانیە ئەوا لەبەرچاوم ناشرینی بکەیت و لەبەردڵم ڕەشی بکەیت ، و لەو باشتر و چاکترم پێ ببەخشیت .

*　*　*

## کامێرای پرۆفیشناڵ*

چاکە دەکەن بەڵام لەهەمان کاتیشدا خراپە دەکەن ..
ئەوانەی خێر ئەبەخشنە هەژار و کەمدەستەکان بۆ ئەوەی خودا بەرەکەت بخاتە ماڵ و سامانیانەوە، وە بۆ ئەوەی هەست بە ئازاری کەسانی تر بکەن ..
وە پێش ئەوەی ئەو شوێنە بەجێبهێڵن، خێریان پێ ئەبەخشنەوە و داوا لە هەژارەکان دەکەن کە وێنەیەك یان پارچە ڤیدیۆیەکیان لێ بگرن بۆ دیکۆمێنتکردنی خێرەکە !.
لەسەرخۆبە !.
هەژار و کەمدەستەکانیش مرۆڤن و هەست و غروریان هەیە، برینداریان دەکەن کاتێك خێرەکەیان پێدەدەن و وێنەیان دەگرن .. با ئەو کارانە تەنها بۆ خودا بێت، وە داوای پاداشت تەنها لە خودا بکەن، پێویست ناکات ئەو وێنانەیان بڵاوبکەنەوە بۆ ئەوەی ناوبانگ و خۆشەویستی خەڵک بەدەست بهێنن، یان بانگەشەی ئەوە بکەن کە ئێوە بەخشندەن !. خودا ئاگای لە هەموو ئەو شتانەیە کە دەیبەخشن، تەنانەت بە وشەکانیشتان چاکە بکەن بۆ ئەوەی خەڵکی لاسایتان بکاتەوە، ئێوە هەست بە مەودای ئازار و پێداویستیەکانیان ناکەن، ئەوان پێویستیان بە ئێوە نیە، خودا خۆی ڕزقیان پێ دەبەخشێت بەبێ ئەوەی هەستی پێبکەن، خودا ئێوەی بۆ ئەوان ناردووە تاوەکو ئەوەی بە ئێوەی بەخشیووە ئێوەش بە ئەوانی ببەخشنەوە ..
ڕەنگە ڕۆژگار بسوڕێتەوە و ئێوەش بچنە شوێنی ئەوانەوە !.

* * *

## دڵە بەخشەرەکان*

باوکم بە دڵێکی پڕ لە خۆشەویستیەوە پێم دەڵێت:
کچەکەم، کاتێك داوای لێخۆشبوون لە خودا دەکەیت، با نیازی لێخۆشبوونەکەت بۆ خۆت و دایك و باوکت و هەموو موسڵمانان بێت..
ئەگەر گوڵێکت ئاودا ئەوا داوا لە خودا بکە کە پاداشتەکەی بۆ خۆت و هەموو موسڵمانان بێت .. ئەگەر هەر پیتێکت نووسی وا بکە کە موسڵمانانیش بەژدار بن لە پاداشتەکەی .. ئەگەر نزات کرد ئەوا مردووان و زیندووانی موسڵمانان بەژدار پێبکە لە نزاکانتدا، ئەوا پاکترە بۆ دڵت، هەندێک کەس هەن کە زۆر دەوڵەمەند و بەناوبانگن بەڵام لە نزاکانی کەسدا نابینرێن ..
بەخشەربە تەنانەت لە قسەکردنەکانیشتدا، کردەوە شاراوەکانت فریادڕەس و ڕزگارکەری تۆن، وە لەلای خودا هیچ شتێك وون نابێت ..

* * *

کاتێـك دەبەخشیت زەردەخەنە بکە ..
چونکە زەردەخەنەکانت لە کاتی بەخشیندا دووەمین بەخشینە کە هیچ کەس ناتوانێ هەستی پێ بکات جگە لە پێ بەخشراوەکە نەبێت ..
بەخشندە بە لە هەستەکانت و دیارییەکانت، وە بە خۆشەویستیەوە خەرجیان بکە

* * *

چەند ڕۆژێك لەمەوبەر ئازارێکم توشبوو، لە خۆمەوە لە ساتێکدا بە دایکم گووت کە هەست بە ئازارێکی کەم دەکەم لە گەددەم .. دواتر کاتێك چووم بۆ سەردانی براکەم ئازارەکەم نەما .. دوای یەک ڕۆژ لە سەردانیەکەم دایکم تەلەفۆنی بۆ کردم گووتی: کچم هێشتا ئازارەکەت لانەچووە؟.
سەرسام بووم بە پرسیارەکەی، گووتم: کام ئازار ؟
گووتی مەبەستم گەددەتە کچم !. وڵامەکەی منیش گریان بوو ..
شتێکی زۆر سادە و ئازارێکی زۆر کەمم هەبوو کە بە دایکمم ووت، بەڵام ئەو قسەیەی منی لە مێشکیدا دەرنەچووبوو، وە بیری لە ئازارەکەی من کردۆتەوە،و ڕەنگە دوو هێندەی من هەستی بە ئازار کردبێ !. من لە بیرم کرد کەچی دایکم ئازارەکەی منی لە بیر نەکرد !.
ئەو دایکانە چ دڵێك لە سینەیاندا هەڵدەگرن ؟!
باوەشی دایکم دەرمانێکی هەمیشە بەردەستە.. ئەو ئارامییە،
بۆیە کاتێك هەست بە ئازارێك یان دڵتەنگیەك دەکەم یەکسەر ئەڕۆم و باوەشی پێدا دەکەم، تەنانەت ئەگەر ئەو کاتە پێویستم بە بێدەنگی بێت ، دایکم هەستم پێدەکات و لەبێدەنگیەکەم تێدەگات، باوەشی ئەو دەتوانێت هەموو ئەو خەمانەی کە هەمە لایانبەرێت بە هێزی خودا .. بۆیە هەندێکجار دڵتەنگ دەبم کاتێك بیر لەو کەسانە دەکەمەوە کە دایکیان لە دەستداوە، جا چ هەتیوو بن یان دوور لە ماڵ بن .. خودا یارمەتی ئەو کەسانە دەدات کە دایکیان لە دەستداوە .. بۆ ئەوەی هەمیشە یادیان بکەنەوە بە خێرکردن بۆیان و دوعاکردن بۆیان ..
پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی کە ئارامی خستۆتە باوەشی ...

* * *

قسەیەکی هاوڕێیەکەم هاتەوە یاد کاتێك ئامۆژگاریان دەکرد بەم جۆرە قسانە:
(پاساو بۆ کەس مەهێنەوە لەسەر کرداوەکانت، جا چ بە هەڵە تێبگەن، یان کاتێك بە هیچ شێوەیەك تێناگەن قسەکەت دەدەن بە هەواوە )) ئەو دەیەوێت پاساو بۆ قسەکانی و کردارەکانی بهێنێتەوە بۆ ئەو کەسانەی کە خۆشیاندەوێت
کاتێك ئەو کەسانەی کە خۆشماندەوێت بە هەڵە لێمان تێدەگەن، پێویستە لە سەرمان پاساو بهێنینەوە، وە بە شێوەیەکی جوان ڕوونکردنەوە بدەین، بۆ ئەوەی تێبگەن لە بیرکردنەوەمان، نەك ئەوەی بێدەنگبین و بەردەوام بێڵێین:
((هەر کەسێك منی خۆشبوویێت ئەوا پێویست ناکات پاساو بۆ کردەوەکانم بهێنمەوە، هەر کەسێك منی خۆشبوویێت ئەوا خۆی لێم تێدەگات!. ئەگەر پاساو بهێنمەوە، ئەوانەی خۆشمدەوێن لەدەستیان دەدەم!. ئەگەر من پاساو بهێنمەوە ئەوا کەس لێم تێناگات!.))
دڵگران مەبە .. پاساو هێنانەوەت زیانت پێ ناگەیەنێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەوەی خۆشی ئەوێیت لێتدەگات، وە هەڵەتێگەیشتنتان نامێنێت، و بارودۆخەکەت بەرز دەنرخێنێت، و بە جێتناهێڵێت ..
هەندێکجار بارودۆخمان کۆنترۆڵی کاردانەوەکانمان دەکەن، و میزاجمان دەگۆڕێت .. وە ئەگەر لێشت تێنەگەیشتن ئەوا دڵگران مەبە، ئەوەی کردووتە بە خودای بسپێرە، خودا پاداشتی کەس بە فیڕۆ نادات ..
لەبارەی ئەو فەرموودەیە بۆم بدوێ کە پێغەمبەر(د.خ) کاتێك پاساوی بۆ کارەکەی هێنایەوە لەو کاتەی دوو پیاو لە ئەنسارییەکان بینیان لەگەڵ سەفیەی خێزانیدا، پێغەمبەر (د.خ) پێی فەرموون: ((عَلَى رِسْلِكُمَا، إِنَّهَا هِيَ صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيِيٍّ، قَالَـا: سُبْحَانَ الله يَا رَسُولَ الله، وَكَبُرَ عَلَيْهِمَا مَا قَالَ، قَالَ: إِنَّ شَيْطَانَ يَجْرِي مِنْ ابْنِ آدَمَ مَبْلَغَ الدَّمِ وَإِنيِّ خَشِيتُ أَنْ يَقْذِفَ فِي قُلُوبِكُمَا)).(صحيح البخاري) ، واتا: (لەسەر خۆتان، ئەوە صفیەی کچی حُیَّەیە، ئەوانیش وتیان: سبحانه الله ئەی پێغەمبەری خودا! (جەنابت جێی گوومان بیت)، فەرمووی: لە ڕاستیدا شەیتان وەك خوێن بە لەشتاندا دەگەڕێ، منیش ترسام لەوەی کە گوومانی خراپ بخاتە دڵەکانتانەوە).

* * *

**نەرم نیان بە لەگەڵ کرێکارانی پاککەرەوە، وە لەگەڵیان خۆبەزلزان مەبە .. جێی شەرمەزاری نیە کە سڵاو لە یەکێك لە کرێکارانی پاککەروە بکەیت کاتێک دەیانبینیت، ئەوان دڵخۆش دەبن بە وشەیەکی جوان لە تۆوە، دەتوانیت بیهێنیتە پێش چاوی خۆت ئەو کەسە چەند دڵخۆش دەبێت ئەگەر هەواڵی خۆی وخێزانەکەی لێ بپرسی ، و لێی بپرسیت ئەگەر پێویستی بە شتێك هەبوو .. زەردەخەنەیەکی قوڵ لەسەر سیماکانیدا دەبینیت بەهۆی پرسیار وگرینگیپێدانەکەت .. وە لەلایەن خوداوە پاداشت وەردەگریت بەهۆی ئەوەی دڵخۆشیت خستۆتە دڵیەوە ..**

* * *

**ئەو نامانەی بێهوودەن***

**ئەو نامەنەی کە بۆ مرۆڤەکان دەنووسین، ڕەنگە نەیخوێننەوە، یان درەنگ بکەون لە وڵامدانەوەی، یان ئەوەی کە دڵیان غرور بیگرێت و خۆیان بە گەورە بزانن لە وڵامدنەوەی ..**
**تەنها ئەو نامانەی بۆ خودا دەیانووسین پشتگوێ ناخرێن ..**
**ئەو نەهێنی و شتە شاراوەکانمان دەزانێت، وحەزی لە پرسیار و پاڕانەوەکانمانە، جا ئەو پەیامانە بە هەر شێوەیەك و هەر زمانێك بن، وە ئەگەر ئەو پەیامانە بێدنگیش بین، بەسە بە چرپاندنیان لە دڵدا، گرینگ ئەوەیە بە باوەڕێکی پتەوە بینوسیت و بەوەی کە خودا ئاگادارە لە هەموو کارێکمان، و گومانی باش ببەی بە خودا بەوەی ئەو شتانەی کە دەمانەوێت بۆمان دەهێنێتە دی ..               کاتێك تەمەنم دوانزە ساڵ بوو چەند نامەیەکم بۆ خودا نووسی، داوام لە خودا کرد ئاواتەکەم بۆ بهێنێتە دی، هەموو کەسێك گاڵتەی پێدەکردم بەوەی کە ئاواتەکەم نایەتە دی بەم تەمەنە بچووکەمەوە، هەموو وردەکارییەکانی نامەکەم نووسی، بە پشتیوانی خودا لە هەمان ساڵدا ئاواتەکەم هاتە دی ، هەموو وردەکاری نامەکەم بە ویستی خۆم نووسی .. خودا بە ئاگایە لە هەموو شتێک کە هەیە .. ئەو ئاگاداری هەموو ئەو ئاواتانەیە کە دڵمان بە خۆشەویستی و میهرەبانیەوە ئاواتی بۆ دەخوازێت .. وە ئەوەی شایەنمان بێت پێمان دەبەخشێت.**

* * *

منداڵێك هەبوو هەمیشە پێش ئەوەی بخەوێت دەیگووت: ئەی فریشتەكانی خودا هەڵمستێنن بۆ نوێژی بەیانی ..
وە بە تەنها هەڵدەستا بۆ كردنی نوێژی بەیانی، كاتێك خەو بیبردایەتەوە و هەڵنەستایە بۆ نوێژ، بۆ بەیانیەكەی دەگریا و دەیگووت: لەوانەیە خودا لێم توڕە بێت، بۆیە زیاتر دوای لێخۆشبوونی دەكرد ..
ئەو منداڵە گەورە بوو، وە بەردەوام بوو لەو گفتوگۆیەی نێوان خۆی و بەدیهێنەرەكەی .. هیچ بەربەستێك نیە لە نێوان ئێمە و خودا، بە بێ ئەوەی قسە بكەین لێمان تێدەگات و دەزانێت چی لە دڵماندا هەیە، وە گوێ دەگرێ بۆ ئەو گفتوگۆیانەی نێوان خۆمان و ناخمان، وە پێویست ناكات قسەكانمان بڕازێنینەوە و وشەكانمان ڕێكبخەین، ئەو لە هەموو شتێكی ناخمان تێدەگات، بەڵام دەیەوێت دڵمان تەنها بە ئەوە وە پەیوەست بێت، و تەنها لە ئەو بپاڕێینەوە بۆ هەموو شتێك، وە لە پێش هەموو شتێك تەنها داوا لە ئەو بكەن ..

* * *

## له باڵكۆنی هیودا*

دڵت چۆنه؟
ئه‌و خۆشبه‌خته؟ یان گله‌یی له‌ خه‌مبار بوونی ده‌كات؟
ئێمه‌ پێمان وایه‌ ده‌بێت به‌خته‌وه‌ری به‌ ورده‌كاری گه‌وره‌ له‌ ژیانماندا ڕووبدات، به‌ڵام له‌ ڕاستیدا ده‌توانین زیاتر له‌و شتانه‌ بیدۆزینه‌وه‌ كه‌ ئێمه‌ پێمان وانیه‌ ببنه‌ هۆی به‌خته‌وه‌ری بۆمان، وه‌كو ئه‌و شته‌ بچووكانه‌ی كه‌ ئێمه‌ گوێی پێ ناده‌ین ..
وه‌ك بانگهێشتێك له‌ كه‌سێكه‌وه‌ كه‌ تۆ خۆشیت خستۆته‌ دڵیه‌وه‌ ..
وه‌ك پێكه‌نینی كه‌سێک كه‌ له‌ ته‌نگانه‌دا بووه‌ و دواتر به‌هۆی قسه‌كردنت له‌گه‌ڵیدا زه‌رده‌خه‌نه‌ ده‌چێته‌ سه‌ر لێوه‌كانی ..
وه‌كو ئه‌وه‌ی شتێك به‌ هه‌ژارێك ببه‌خشیت كه‌ زۆر پێویستی پێه‌تی و به‌ڵام پاره‌ی پێ نیه‌ تا بیكڕێت ..
وه‌ك گرینگیدانت به‌ هه‌تیووه‌كان و ده‌ست به‌سه‌رهێنانیان دوور له‌ شه‌رم ..
وه‌ك به‌دیهێنانی خه‌ونێك بۆ یه‌كێكیان ..
وه‌ك ئاودانی ڕووه‌كێك كه‌ خه‌ریكه‌ له‌ تینووه‌ ده‌مرێت ..
ئه‌مانه‌ شتانێكی زۆر بچوكن به‌ڵام واتای زۆری هه‌یه‌ بۆ ده‌وروبه‌ره‌كه‌مان، ڕه‌نگه‌ به‌هۆی دووعای كه‌سێكیان كه‌ له‌ دڵه‌وه‌ بۆی كردوین خودا به‌خته‌وه‌ریمان پێ ببه‌خشێت، و بمانخاته‌ به‌هه‌شته‌وه‌ له‌ ڕۆژی دواییدا ..
[[يَوْمَ لا يَنْفَعُ مَالٌ وَلا بَنُونَ* إلا مَنْ أَتَى اللهُ بِقَلْبِ سَلِيمٍ]] (الشعراء٨٩ ــ ٨٨)

* * *

**ئەو خودایەی کە هەر حەوت ئاسمانەکەی دروستکردوە، وە هەموو شتێکی بە وردی، و بە باشترین شێوە ڕێکخستووە، و داهێنانی کردووە لە دروستکراوەکانی، و بژێوی بەخشیووە بە هەموو بونەوەرەکانی سەر زەوی، وە ئاگای لە ناخی هەموومانە کە چی تێدایە، و هیچ شتێک لای ئەو شاراوا نیە، ئایا ئەو بێتوانایە لەوەی کە ئاواتەکانت بەدیبهێنێت !. حاشا پاك و بێگەردی بۆ خودا، ئەو بەدیهێنەر و دابینکەری تۆیە ..**

**هەموو ئەوەی پێویستە بیکەیت گومانی باش بردنە بە خودا، بەپێی ئەم حەدیسە قودسیە، کە خودا دەفەرموویت:[[ أنا عندَ ظَنِّ عَبْدِي بي، فَلْيَظُنَّ بى ماشَاءَ ]]، واتا: من لەگەڵ گومانی بەندەکەمدام، با گومانم پێ بەرێت بەوەی دەیەوێت**

**ئەو زاتە بەخشندەیە لەکاتی گونجاو و دیاریکراودا بە ئاواتەکانمان دەڵێت: ببە، وە دەبێت، هیچ کەس لەو زاناتر نیە، متمانەت بە خودا هەبێت .. هەر دڵێك متمانەی بە خودا هەبێت و نیازی بە ئەوەوە توند کرد هەرگیز نادۆڕێت ..**

* * *

**خۆت دڵخۆش بکە، وە چاوڕێی کەس مەکە کە دڵت خۆشبکات؛ چونکە کاتێك چاوەڕێی کەسێك دەکەیت و وێنەی بەختەوەریت بە بوونی ئەو دەبەستیتەوە، ئەوا ڕەنگە ئەم خۆشیە کاتی بێت، وە ڕەنگە ئەم خۆشیە نەمێنێت بە نەمانی هۆکارێك یان نەمانی ئەو کەسەی کە خەیاڵت بۆ کردووە و بەختەوەریت پێ بونیاد ناوە ..**

**ئەو کاتە تۆ خەمبار دەبیت، دڵت تووشی خەم و خەفەت دەبێت، بۆ ماوەیەکی زۆر بەدوای بەختەوەریدا دەگەڕێیت و نایدۆزیتەوە، هەندێك کەس دۆزیانەوە وە بە پێی قسەی خۆیان ئەوان دڵخۆشترین کەس .. بەڵام ئەوانی تر ئەوەشیان نەدۆزیەوە .. بەختەوەری ڕاستەقینە ئەویە کە نزیك بیت لە بەدیهێنەرەکەت (خالقکەت) کە دڵمان ئاسوودە و ناخمان پاك و ڕوون دەکاتەوە . خودا دەفەرمووێت: [[الَّذِينَ آمَنُوا وَتطْمَئِنَّ قُلُوبُهُمْ بِذِكْرِاللهِ أَلا بِذِكْرِ الله تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ]] ( الرعد: ٨١ )، مرۆڤەکان ئەو کەسانەیان خۆشدەوێت کە لێوبەخەندە و دڵخۆشن، ئەوانەی کە دڵیان فراوانە و بە خۆشەویستیەوە مامەڵە لەگەڵ دەوروبەرەکەیاندا دەکەن ..**

*** * ***

**هیوا ببەخشە کەسانی دەوروبەرت، وە ئەگەر هاتوو ئەو هیوایەش بە ناڕاستی بێت، ڕەنگە ئەوە تاکە هیوای ئەو کەسە بێت، بۆ ئەوەی پەنجەمۆری هیوا بکێشی لەسەر لێوەکانیان، کە بەهۆی ئەو بارودۆخەی کە تێی کەووتبوون تیاچووبوون، یان لەبەر تووشبوونیان بە نەخۆشیەك ..**

**بە دوای هیوا بگەڕێ کاتێك هەست بە وونبوونی دەکەیت، دڵنیابە لە هەموو تونێلێکی ژیاندا، چاوەڕێی تۆیە بۆ ئەوەی ڕووناکیەکەی داگیرسێنیت و تاوەکو بە درێژای ڕێگاکانی ژیان لەگەڵت بێت ..**

**مرۆڤ ئەگەر یەك زەڕە هیوا لە دڵیدا بێت دەتوانێت بژی، بەڵام ئەو مرۆڤەی کە دڵی خاڵیە لە هیوا، قورسترین ژیانی هەیە !. نەکەی هیوای کەس بدزی ..**

**چونکە هیوا کاڵایەك نیە بۆ کڕین، بەڵکو ئەوە لە قوڵای دڵدایە ..**

**هاوڕییەتی کەسێك بکە لە ژیان کە هیوات پێ ببەخشێت .. وە هەمیشە سوپاسی خودای گەورە بکە کە موسڵمانیت و خاوەن پەنجەرەیەکی هیوایت کە هەرگیز**

ڕووناکیەکەی کەم نابێتەوە .. ئەو لە دڵتدایە وەکو ڕووەکێکی چنراو، کە ئاوی دەدەیت بە پەرستنی خودای خاوەن دەسەڵات ..

*   *   *

[[ لا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْراً ]] (الطلاق: ١)

ئەی دڵ سەر لە نوێ بیخوێنەوە .. کە تۆ نازانیت، و تەنها خودا دەزانێت چی باشترینە بۆ تۆ ..

ئارامبە، دڵنیابە کە دوای ماندوبوون پشوودان هەیە ..

دوای گریان دڵخۆش بوون هەیە ..

دوای چاوەڕوانی حەسانەوە هەیە ..

دوای ماڵئاوایی یەکتربینینەوە هەیە ..

دوای نەخۆشی چاکبونەوە هەیە ..

دوای دڵتەنگی پێکەنین هەیە ..

ئەوانە بەخششی خودان، خودا بەو شتانە سەرسامان دەکات کە پێمان وابوو سەرچاوەی ناخۆشیەکانمانن، دواتر پەردەی لەسەر لادەدات، وە زەردەخەنە بەسەر ڕووخسارمان بڵاودەبێتەوە .. تەنها باوەڕت بە خودا هەبێت ..

ئێمە مرۆڤین و هەست بەو شتانە دەکەین کە مرۆڤەکان هەستی پێ دەکەن، خەم سەردانمان دەکات و لەسەر ڕووخسارمان دەنیشێتەوە، و هەموو شتەکانی دەوروبەرمان ڕەنگی ڕەش دایاندەپۆشێت .. خەمبار دەبین وهەرگیز چاوەڕێی ئەوە ناکەین کە دڵخۆشی بێت و لە دەرگامان بدات ..

وە ڕەنگە دەرگایەك لە ئاسمان بکرێتەوە و هەموو واتاکانی دڵخۆشی تێدابێت ..

لە کاتێکدا دڵمان پێشبینی ئەوەی نەدەکر کە دڵخۆشی سەردانی بکات ..

تەنها گەشبین بن بەوەی کە ڕۆژانی داهاتوو زۆر جوانترە لەوەی کە ڕۆشت ..

چونکە لە ئاسمانەکان پەروەرێنێك هەیە کە هەموو شتێك بەڕێوەدەبات ، وە ئەو هەمیشە باشترینە بۆ بەندەکانی .

*   *   *

**کاتێك بە ساتە خۆشەکانی ژیانماندا دەڕۆین، بەهۆی زۆر دڵخۆش بوونمان، لە ناخەوە هەست دەکەین کە لە تواناماندا هەیە ئەو ئیشانە بکەین کە لە ڕابردوودا بۆمان زەحمەت بووە، ئەوکات ئەو خۆشیەی کە لە دڵماندایە دەگۆڕێت بۆ داهێنان، وە شتانێك دروست دەکەین لە ژیانماندا کە پێشتر پێمان دەگووت: (زەحمەت و مەحاڵ) .. بۆیە وشەکانیشمان لە دڵەوە بە ڕاستگۆیانەوە دەردەبڕین بەبێ هیچ دروستکردنێك، و هەست بە تێربوون لە کارەکەمان دەکەین.**

**وە بە ئاسانی: لە ساتە جوانەکان، هەموو شتەکانی دەوروبەرمان لە بیر دەکەین و تەنها خۆشی بڵاودەکەینەوە، وە پێکەنینێك ئەخەینە ناو دڵەکانەوە کە ڕەنگە ڕۆژگار هەرگیز نەیسڕێتەوە .. ئەو ساتانە چەند جوانن، وە جوانتریش دەبێت ئەگەر لەگەڵ خۆشەویستاندا دابەشیان بکەیت ..**

***   *   ***

**چارەنووس هی خودایە و ئەوەی بیەوێت دەیکات ..**
**دڵی ماندووم دەحەسێتەوە، کاتێك بیرم دەکەوێتەوە کە ئەوەی بەسەرمدا هاتووە چارەنووسە و لەلایەن خودای میهرەبانەوەیە، وەك کومەڵە پیتێك یەکیان گرتووە کە جوانترین وانەی تێدایە !.**

***   *   ***

## شکاندن و زۆرکردن*

لار مەبەوە بەسەر شانی مرۆڤەکان لە کاتی لاوازی و دڵتەنگیدا، چونکە شانی مرۆڤ لاواز و ناسکە، وە لە هەر کاتێدا بێت ڕەنگە ئەو کەسەی پشتی پێ دەبەستی دیارنەمێنێت .. دڵتەنگیەکەت لەسەر بەرماڵی نوێژەکەت فڕێ بدە، و بە دوعاکانت خۆت لە باوەش بگرە بۆ ئەوەی خودا خەمەکانت بۆ کەم بکاتەوە و ناخۆشیەکانت لە کۆڵ بکاتەوە ..
تەنها خودا لە هەموو حاڵەتێکدا لەگەڵمان دەمێنێتەوە ..
پێویستمان بە مرۆڤێکە کە گرینگیمان پێ بدات و سەرقاڵ بێت پێمانەوە، وە ڕەنگە بەو شێوەیە هەستمان پێ نەکات کە خۆمان دەمانەوێت .. وە یان ڕەنگە خەوتبێت، وهەست بەو ناخۆشیانەی ناخمان نەکات کە تووشمان بووە.
دەردەدڵ و نیگەرانیەکانت بە خودا بسپێرە ..
باوەڕم پێ بکە، ئیتر دڵت بێ هیوا نابێت!. مادام لەگەڵ خودای هیچ کەس ناتوانێ دڵت بشکێنێ، خودا میهەرەبان و بە دەسەڵاتە بەسەر دڵمەکانمان، هەر کاتێ ویستمان ئارام ببینینەوە، دوو رکعان نوێژ بۆ خودا دەکەین و دەپاڕێینەوە، دەست بەجێ لەناو دڵنیایی و دڵنەوایدا نووقمان دەکات ..
جیاوازی هەیە لە نێوان ئەو کەسەی گلەیی لە خەڵک دەکات لە خەم و زەبوونی خۆی .. وە کەسێک گلەیی لە خودا بکات .. گلەیی کردن لە خوداو قسەکردن لەگەڵیدا ئارامبەخش و هێز پێ دەر و دڵنەواییە ! وە بۆ غەیری خودا ڕیسواییە!.
بە دڵت بڵێ خودا لەگەڵمە، هیچ شتێك خەمارم ناکات !..

* * *

مرۆڤەکان دەمانشکێنن و شکستمان پێ دێنن .. وە پەروەرێنی مرۆڤەکان شکاندن و شکستەکانمان چاك دەکاتەوە .. تەنها خودا دەتوانێت ئەو زاممانەمان سارێژ بکات کە مروڤەکان دروستیان کردووە لەسەر دڵمان. وە بە نزیك بوونەوە لێی ئارامیمان پێ دەبەخشێت، ڕەنگە مرۆڤەکان تووشی شکستمان بکەن، بەڵام ئەو شکستەیان وەکو دڵئێشەیەکی یان هەڵمێکی کاتی دەبێت بۆ دڵمان، وە خودا هەمیشە چاکمان دەکاتەوە و سەرمان دەخات تەنها بە ووتی: یا الله ..

* * *

## بە خۆشیەوە پێچرایەوە*

ئەم چەند ساڵەی ڕابردووم تەنها بوون بە یادگاریەك بۆم .. ئەوە شتەی کە گریاندوومی ، ئێستا دەمخاتە پێکەنین .. شریتی یادەوەریەکان بە پێش چاومدا تێپەڕ دەبن ، زەردەخەنەیەك بکە و بڵێ : یا الله
ئەمە لە غیابی مندا بە خراپە باسی دەکردم، و لە گۆشتی منی دەخوارد، و زۆر زیانی پێ دەگەیاندم، ئای لە ڕەحمی خودا چەند گەورەیە کە ئەو کەسەی ئێستا لە ژیانمدا کردۆتە دەرەوە ..
ئەمەیان لە ژیانمدا وای لێکردم زۆر بگریم؛ تەنانەت یەك ڕۆژیش شایەنی من نەبوو، خودا بە ڕەحم و بەزیی خۆیەوە لە ژیانمدا کردیە دەرەوە .. سوپاس بۆ خودا .. ئەو کێ شایەنی من بێت لە ژیانمدا لە کاتی خۆیدا پێم دەبەخشێت ..
ئەم هاوڕێیە واتای زۆری هەبوو بۆم، جیابوونەوە لێی وای لێ کردم زۆر بگریم، دواتر دڵم خاڵی بووە لێی چونکە پەیوەندیەکەمان بەیەك پچڕا ..
ئێستا من پێدەکەنم و دڵم خۆشە
لەبەر ئەوەی خودا هاوڕێی باشتری پێ بەخشیووم ..
ساڵەکان تێپەڕین و .. فێربووم .. و بیر و فکرم زیاتر پێ گەیشت ..
ئێستا بە پێکەنینەوە پێشوازی لە هەموو شتێك دەکەم، تەنها چارەسەر بۆ ئەو کێشانەی کە ڕووبەڕووی بوومەوە ئەوە بوو کە پەروەرێنەکەم بە هێزی خۆمم دادەنا؛ لەبەر ئەوەی دڵمان تەنها بەخودا بەهێز دەبێت نەك مرۆڤەکان ..

* * *

بە زەردەخەنەوە پێشوازی لە بەیانیەکانت بکە، خودا ڕزقێکی پی بەخشیووی کە زۆری لێ بێ بەش کردووە ..
کاتێك لە خەو هەڵدەستی سوپاسی خودا بکە؛ لەبەر ئەوەی ڕۆژێکی نوێی پێ بەخشیووی لە ژیانت، و هەلێکی نوێ بۆ بڵاوکردنەوەی هیوا پێ بەخشیووی؛ بۆیە باڵانسێکی زۆرت لە زەردەخەنەکانت و بڕوا بە خۆبوونت هەبێت؛ هەنێك کەس هەن پێویستیان بەو زەردەخەنە شیرین وجوانەتە، وا بکە کە کەسی لێ بێ بەش نەکەیت. زەردەخەنە بکە تەنانەت بە ڕووی ئەو کەسانەی کە بە ڕوودا پێناکەنن، ئەگەر لە ناخیشدا ئاگرێکی بە تین هەبێت؛ چونکە هەڵەی ئەوان نیە کە تۆ ئاوا بە ووشکی و گرژومۆنیەوە ببینن لەبەر ئەو نیگەرانیانەی کە تووشی بوویتە. پێویستە فێری هونەری ئاوێنە ببیت، لە هەموو ڕۆژێکتدا پێش ئەوەی بچیتە دەرەوە لە ماڵەوا، لە ئاوێنەکەتدا زەردەخەنەیەك بۆ خۆت بکە، تۆ تەنها لە سەرەتای ڕۆژەکەدا زەردەخەنی خۆت دەبینیت، بەڵام ئەوانی تر تەواوی ڕۆژەکە دەتبینن، تەنها بە دەربڕینی سیماکانت
دەزانن کە ئایا گەش بینیت یان نا .. ڕووخسارت بکە بە ئاوێنەیەك کە هەموو کەسێکی دەوروبەرت بیەوێت سەیری بکات تا ڕووناکی گەشبینی جیهان لە ڕووخسارتدا ببینن، وایان لێ دێت لە تۆوە ووتە وەربگرن ..

* * *

هێزێك بۆ دروستکردنی ئەو کۆسپانەی کە بەسەرمدا هاتووە ،بۆ ئەوەی هەست بە هێزێکی ناوەکی بکەم کاتێك وا بیردەکەنەوە کە شکاو و ڕووخاوم .. وە پێ بکەنم هەر چەندێك کارەکەشم سەخت بێت .. وە هەر جارێك کەووتم بە هەستانەوەم سەرسامیان بکەم ..

* * *

لە قوڵایی باوەڕ بەخۆبوونەوە دەزانم کە هەرکەسێك بێتە ژیانمەوە و بچێتە دەرەوە، هەرگیز من لە یاد ناکات ..
ئەمە خۆبە گەورە زانین نیە، بەڵام هەرگیز ڕۆحێکی وەك ڕۆحی من نادۆزیتەوە.

*   *   *

**من باوەڕم وایە کە هەندێك کەس خەڵاتن، خودا وەکو دیاریەك لە ژیانماندا پێمان دەبەخشێت، وە ژیانمان دەگۆڕن بۆ باشتر و، ڕۆژەکانمان ڕووناکتر دەکەنەوە، و پەنجەمۆری خۆیان بەو پەڕی خۆشەویستیەوە لامان جێدەهێڵن .. (بەخیل)مەبن لە هەستەکانتان و ئامۆژگاریەکانتان و زەردەخەنەکانتان، بۆ ئەوانەی کە خۆشتان دەوێن ، تەنانەت بە یەك وشەش بێت ڕەنگە ئەو ڕۆژەیان بگۆڕن، جا چی بگات بەوەی بە کردارەکانتان بیکەن!.**

*   *   *

**حەزم لە گوڵە، و حەزم لە دیمەنەکەیەتی بە هەموو ڕەنگەکانیەوە ..**
**بەڵام کاتێك منداڵ بووم رەقم لەوەبوو کە گوڵم پێ بدرێ؛ نەك لەبەر ئەوەی حەزم لێ نیە!. بەڵام مرۆڤی بیردەهێنامەوە کە چۆن هەر بە بچوکیەوە گەورە دەبێت و دڵخۆش دەبێت هەر لە سەرەتای لاوێتیدا،و دواتر بەهاری تەمەنی هەڵدەوەرێ، وە ئەوەندە بە خێرای تێپەڕدەبێت کە کاڵ و پیر دەبێت ..**
**تەنانەت بۆنەکەشی ئەو کەسانەم بیردەخاتەوە کە خاوەن کەسایەتێکی باشن ..**
**وەکاتێك گەورە بووم ئەو بۆچوونە قوڵەم بۆ گوڵ گۆڕا، وە دڵنیابوومەوە لەوەی کە هیچ کەسێك بۆنەکەی و کاریگەریەکەی نامێنێت**
**جگە لە کەسی باش و چاکەکار ..**

*   *   *

**دوونیا دەوران دەورانە***

**جارێکیان یەکێکم بینی شێوەی تێکچووبوو، لە دڵی خۆمدا ووتم ڕەنگە ڕۆژگار بسوڕێتەوە و ئەوەی تووشی ئەو بووە تووشی منیش بێتەوە ..**
**دەڵێن: فڵان جوانە، یان فڵان ناشرینە ..**
**لۆمە لە دروستکراوەکانی خودا دەگرێت بە دیتنی کەسێکی نابینا یان کەسێکی ئیفلیج یان کورتە باڵایەك، یان لەبەر ئەوەی زیپکەیەکی زۆری لە ڕووخساردا هەیە ، یان لەبەر لاوازیەکەی یان قەڵەویەکەی ..**
**کاتێك گاڵتە بە کەسێك دەکەیت و لۆمەی دەکەی، لەبیرت بێت ڕەنگە ڕۆژێکیش بێت و تۆش وات لێ بەسەر بێت .. ئەو کات تۆش هەست بە ئازار و هەستەکانی دەکەیت .. بۆیە هەمیشە ڕەچاووی ئەوە بکە، وە گاڵتە بە کەس مەکە!.**
**خودا ئەو زاتەیە کە ئێمەی بەدیهێناوە جا هەر ڕەنگێك بین یان هەر شێویەك بین، بەتەنها ئەو ئێمەی مرۆڤی بە تایبەت دروستکردووە و ڕێزی لێ ناوین ، خودا دەفەرمووێت: [[ لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ]] ( التين: ٤ )**
**سوپاسی خودا بکە کە بەرەکەتی تەندروستی وباشی پێ بەخشیووی،**
**وە تۆ جوانیت جا هەر ڕەنگێك بیت یان هەر شێوەیەك بیت، وە هەموو ئەو شتانەی دەیبینیت جوانن، چونکە دروستکراوی خودایە ..**
**وە ئەگەر کەسێکی نەخۆشت بینی یان کەسێك کە تووشی کێشەیەك بوو بێت، ئەوا پەنا بگرە بە خودا لەوەی کە تووشی تۆش نەبێت، وە بەردەوام ئەم دوعایە بڵێوە کە لە سوونەتەکانی پێغەمبەرە (د.خ): (( الحمد الله الذي عافاني ما ابتلاك، و فضَّلني على كثير ممن خَلقَ تفضيلاً ))، واتا: ( سووپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەی کە پاراستمی لەو بەڵایەیی کە بەسەریدا هێناوێت، و فەزڵی بە من بەخشی بەسەر دروستکراوەکانیدا )، " پێویستە لەکاتی ووتنی ئەم دوعایە نەهێڵیت ئەو کەسەی بەڵای بەسەر هەتووە گوێی لێ بێت "**
**وە بەچاووی کەمەوە سێری کەسی تووشبوو مەکە، بەڵکو لە خودا بپاڕێوە بۆی کە چارەسەری بۆ بنێرێت، دڵت پاکبکەرەوە لەوەی کە لۆمەی هیچ دروستکراوێکی خودا نەکەیت با ئەو کەسە هەر جۆرێکیش بێت ..**

*   *   *

وەك چۆن ئیدانە دەكەیت و ڕەخنە دەگری .. ئیدانە دەكرێیت و ڕەخنەت لێ دەگیرێت ..
وەک چۆن ستەمت كردووە .. ستەمت لێ دەكرێتەوە ..
هەر وەك چۆن دڵی ئەوانت تەنگ كردوە و ژیانیانت لێ تاڵ كردووە .. خودا كەسێكت بۆ دادەنێت لە ڕێگاكەدا كە دڵت تەنگ بكات و ژیانت تاڵ بكات ..
هەر وەك چۆن كەسێكت گریاندووە، خودا لە ژیانتدا ڕووبەڕووی كەسێكت دەكاتەوە كە تووشی گریان و دڵتەنگیت دەكات ..
وەك چۆن كەسێكت بێ بەش كردووە لە مافی خۆی، خودا لە ڕێگاكەتدا كەسێكت بۆ دەنێرێت كە مافت زەوت بكات ..
وا بیردەكەیتەوە كە ژیان كردن بەس لە دوونیادا هەیە!.
بە چی وڵامی خودا دەدەیتەوە لە ڕۆژی دواییدا كاتێك لەبارەی ستەم كردنت لە مرۆڤەكان لە دوونیادا پرسیارت لێ دەكەن؟ !.
بە چی مافێك ستەم دەكەیت و مافی خەڵكی دەخۆیت !.
ئەو ستەم و تاوانانەی كە بەرامبەر مرۆڤەكان كردووتە، ئەگەر ئەوانیش لەبیری بكەن ئەوا خودا هەرگیز لە بیری ناكات، حاشا لەوەی كە خودا شت لە بیربكات.
ئەی ئەو كەسەی ستەم دەكەیت و خۆت بە بەهێز دادەنێیت ، هیج بەهێزێك نیە جگە لە خودا، وە تۆ لاوازیت ..
خودا بە دووعای نیوە شەوی كەسێك كە ستەمت لێ كردووە، ڕەنگە ژیانت سەروژێر بكاتەوە، و ئەو كەسانە و ئەو شتانەی كە خۆشتدەوێ لە دەستیان بدەیت !.
دڵی ستەم لێ كراو بەردەوام دەڵێت: (حسبي الله و نعم الوكيل )، واتا: خودامان بەسە كە یاریدەدەر و یارمەتیدەرێكی چاكە؛ ئەو تەنها خودای بەسە و وە ئەو دڵە سەردەكەوێ بە پشتیوانی خودا ..

* * *

## تابلۆ کاتیەکان*

تێپەڕبوونی ئەو کەسانەی لە ژیانماندا و هەڵواسینی تابلۆی هەڵسوکەوتە کاتیەکانیان لە دڵمان، دوای ئەوەی کە دەڕۆن دڵمان پڕ دەکەن لە کوون ..
دڵمان بە نرخە، با بە ورییاوە ئەو کەسانە هەڵبژێرین کە شایەنی لێدانەکانی دڵمانن ..
هەندێك هەن بە قسەکانیان خۆیان لە دڵمان هەڵواسیووە، و لەپشتەوە بە خەنجەرەکانیان لێمان دەدەن، وە سوود لەو باشیەمان بەرامبەریان وەردەگرن ، وە بەجێمان دەهێڵن، دوای ئەوەی ئازاریان داوین ..
دڵی ئێمەش وەك دڵی ئێوە نەرمە، ئەو کەسەی گرنگی بە دڵمان دەدات سەرنجمان ڕادەکێشێ، وە نازانین دڵیان چەند ڕاستە لەگەڵمان، مەگەر خودا بزانێ چی لە دڵیاندا هەیە، بەڵام بە کردەوەکانیان پیشانمان دەدەن ، وە هەتا بەجێمان نەهێڵن نازانین بە ڕاستی چیان پیشانی ئێمە داوە.
بەرامبەر دڵ و هەستەکانمان هەرگیز درۆ مەکەن !.. هەست و دڵمان یاری دەستی ئێوە نین، ئەی دانیشتووانی دڵ لەگەڵمان میهرەبان بن ..
ژیانی هەموو مرۆڤێك پڕە لە وێنەی جوان ..
هەندێک کەس هەن بە بەخشینی گەشبینی و رۆحی هیوا بە کەسانی دەوروبەریان ڕەنگ بۆ ئەم وێنەیە زیاد دەکەن، ئەمە جوانتر و نایابتریان دەکات، وە وایان لێ دەکات کە هەمیشە دوور بن لە نائومێدی و بێزاری ..
خەڵکی بۆ بیرکردنەوە و چێژوەرگرتن لە ژیان لە چوارچێوەی خۆشی و بەختەوەری کۆدەکاتەوە، وەکو کەسێکی ئیلهامدەر بۆیان دەدوێ، هەندێک کەسی تر هەیە وا دەکەن کە وێنەی ژیانیان بە یەك جۆر و بەبێ هیچ سەرنجدانێك بە نێویاندا تێپەڕ بێت، وێنەی ژیانیان دەبێت بە جۆرێك لە بێزاری، و هیچ کەسێك گرینگیان پێ نادات، وە کەس سەرنجی ئەو ڕەنگە خۆڵەمێشیەی ژیانیان نادات بەهۆی نەبوونی ئومێد و نەبوونی هیچ دەستەکوتێک لە ژیانیاندا، وە وادەکەن کەهەموو ڕۆژێکیان لەیەك بچێت و هیچ جیاوازیەکی تێدا نەبێت ..
ئەوە ژیانی تۆیە، و دڵخۆشی و دڵتەنگی لە دەستی خۆتدایە ..
دەتوانیت دڵخۆش بیت و ڕازی بیت بەو شتانەی کە خودا پێی بەخشیووی،

یان خۆت ڕادەستی ئەو خەمانە بکەیت کە بەرە بەرە لە تەندروستی جەستەت دەخۆن ..!

بڕیارەکە بە دەست خۆتە ، کەواتە چی باشە ئەوە بکە، وە چاوەڕێی کەس مەکە کە سوودت پێ بگەیەنێ جگە لە بەدیهێنەرەکەت، پەنا بگرە بە خودا و پشت بە خودا ببەستە لە هەموو شتێك ..
دڵتەنگ بوون کاتیە، و دڵخۆشی زۆرە ..
هەنگ کاتێك دەیەوێت لە شیلەی گوڵەکان هەڵبمژێ، تەنها بە دەوری یەک گوڵدا دەسوڕێتەوە؛ هیچ شتێکی تر نابینێ جگە لەو گوڵە، تا چێژ لە جوانیەکەی وەربگرێت، سێری ئەوە ناکات کە قەدەکەی چەند دڕکی پێوەیە، وە جێ پێی خۆی جێدەهێڵێ لەسەری بەبێ ئەوەی ئازاری پێ بگەیەنێ؛ تۆش وەك هەنگ بە،و جگە لە شتە باشەکان، هیچی تر لە مرۆڤ مەبینە، کەموکورتیان پشتگوێ بخە، خۆ کەسمان کامڵ نین !..
ڕێك وەک هەنگ هەڵسووکەووت لەگەڵ خەڵکیدا بکە ،
بە دوای هەڵەکانیان مەگەڕێ، بەڵکو سەرنجی باشیەکانیان بدە .. کەسێکی ڕووکار بە و نەرم و نیان بە لەگەڵیان تاوەکو خۆشیان بوێیت و دڵیان بۆت بکەنەوە .. هەڵسووکەووتی باشیان لەگەڵ بکە لە پێناو خودا، تا پەروەردگارتان پاداشتان بکات و پلەو پایەتان بەرز بکاتەوە ..

* * *

یارمەتی خەڵکی بدە، جا ئەو کەسانە ئاشنات بن یان بێگانە بن، و با یارمەتیدانەکەت بۆ خودا بێت، ڕەنگە ڕۆژێك لە ڕۆژان تۆش بچیتە شوێنی ئەوان .. ئەستێرەیەك بە لە ئاسمانیان ڕووناکیان بۆ داگیرسێنیت کاتێك پێویستیان بە تۆیە، پێیان ببەخشە و چاوەڕێی وشەی سوپاس و پێزانین مەبە تا بە شانوباڵت هەڵبدەن، و چاوەڕێی ستایشکردن مەبە لێیان، بۆ ئەوەی سوود و چاکەکانی کارەکەت لێ نەسووتێت.
تەنها لەبەر خودا یارمەتیان بدە، و کەسێکی دڵسۆز بە بۆیان .. وە لە لای پەروەردگارەکەت چاکەی زۆرت بۆ دەنوسرێت " ان شاءالله"

* * *

هەستێکی جوانە کە دەست بە ژیانێکی نوێ دەکەی لە پەڕێکی سپیدا ..
بۆنی خۆش و گوڵی پیا پرژینی لەگەڵ ئەو کەسانەی خۆشتدەوێ .. وە جوانترین هەستیش ئەوەیە کە خۆشەویستانت داوای ئەوەت لێ بکەن بەو پەڕی دڵسۆزیەوە ..
تا بگەڕێینەوە بۆ ئەو کۆبوونەوانەی لە بەندەری یادەوەریە بلیمەتەکان کە بە خۆشەویستیەوە ئاوپرژێنی دەکردین، و ئاوازی وەفاییان بۆ دەخوێندین ..
با لە لاپەڕە تاریك و کۆنەکاندا گیر نەبین، کە ئازارەکانی تێدا نوسراوەتەوە، بەڵکو با ئەوانە لەبیر نەکەین کە ڕۆژگارێکی جوانمان پێکەوە هەبوو بە هەوڕێیەتیمان لەگەڵ یەك، وە شاردرابوویەوە لە نێو هەندێك لە کەلێنی دیواری یادەوەرییەکان ..
با ئەمانە بکەینە سەرەتای گەڕانەوەی لێدانەکانی دڵمان سەر لە نوێ ..
با هەمیشە لە چیرۆکەکانمانەوە خۆشەویستی وەربگرین و بەو پەڕی میهرەبانیەوە لە دڵماندا بیچێنین و گەورەی بکەین ..
با ئەو هەموو ئازارە لە بیربکەین کە لە ڕابردوودا بەسەرمان برد، و بیپێچینەوە و لە ژێر پەڕەی لەبیرکردن بۆ دوورترین شوێن فڕەی بدەین .
دڵت بکە بە باخچەیەك لە گوڵی هەڵواسراو کە لە ناوییدا سەرچاوی خۆشەویستی هەڵبگرێ، تا هەموو کەسێك هیوا بخوازێ پێی بگات، تەنها بۆ ئەوەی لە بەربوومەکەی سوود و چێژ وەربگرن ..

وە ئەگەر پێشت نەگەیشتن .. تۆ خۆت بە، بەو بۆنە خۆش و سەرسوڕهێنەرەی دڵتەوە کە خەڵکی خەون بەوە ببینێت کە ڕۆژێك لە ڕۆژان بتوانێت بە دەستی بگات ..

* * *

**سروودی لە دەستدان***

**بچۆ بۆ دەریا و لێی وورد ببەوە، ئایا شەپۆلەکانی دەوەستێت!.**
**شەپۆلەکان ناوەستن!. باشە ..**
**هەموو جارێك ئەو كەسانەی خۆشماندەوێن لە دەستیان دەدەین ، بەهۆی مردنیان یان سەفەر كردنیان، وە یانیش بە ویستی خۆیان لێمان دوور دەكەونەوە، شەپۆلەكان بە ڕۆیشتنی ئەوان ناوەستێت، ئەمەوێت ئەوە بڵێم بۆ هەموو ئەو كەسانەی كە كەسێكی ئازیزیان لە دەستداوە، ژیان وە ڕۆژە ناخۆشەكان ناوەستن بۆ كەسێك كە خۆشەویستانی لە دەستداوە، تاوەكو ئێستا ڕۆژێك گوێمان لەوە نەبووە كە ژیان وەستابێت بۆ كەسێك كە ئازیزێكی لە دەستدابێت ،**
**بەڵكو ژیان بەردەوام دەبێت ، وە یەكێك لە سونەتەكانی خودا لە زەویەكەی لە دەستدانە تا فێرببین، یان تاوەكو بە یەقینەوە بزانین كە تەنها خودا هەمیشە بوونی هەیە، وە ئەوە یەكەم وە دواهەمین پەناگەیە بۆ دڵمان ، هەر چەندێك لە دەست بدەین ئێمە زیندووین، وە هیچ شتێك لە دەست نادەین مادام ویستی خودای تێدا بووە ..**

*   *   *

دڵم بۆم دەدوێ لەبارەی تامەزرۆیی بۆ کەسێکی نەماو کە ڕۆشتووە و یادگاریەکانی نێوانمانی بەجێ هێشتووە ،
ئامۆژگاری و قسەکانی، زەردەخەنەکانی، ئاوازی دەنگی، لە دڵمدا جێ هیشت ..
هەستێکی نیگرانی دەمخنکێنێت کاتێك دەبینم ئەو کەسەی خۆشمدەوێ مردووە، جەستەیەکە کە گیانی تێدانیە بجوڵێت، وا بیردەکەمەو لە هەر ساتێکدا بێت دەگەڕێتەوە بۆ ژیان سەر لە نوێ، وا هەست دەکەم بۆ ماوەیەك دەیەوێ گاڵتە بکات ..
بەڵام قەدەری خودا لە سەروی هەموو شتێکەوەیە .. تێپەڕدەبین و ئەم دنیایە هی ئێمە نیە ..
ڕۆیشتووەکان لە ناو دڵماندان، بۆ ئەوان و بۆ ئێمەش خودا هەیە، بە ڕەحمی خۆی نزیکایەتی هەتاهەتایمان لەگەڵیان پێ ببەخشێت، لە بەهشتەکەی خۆی، هیچ جیابوونەوەیەك لەوێدا بوونی نیە، و باسی تامەزرۆیمان دەکەین بۆیان، هەموو شتەکانی تریان بۆ باس دەکەین .. و زەردەخەنە دەکەین ..
لە پێناو پاك و خاوێنی دڵ، لە دوعاکانتان و خێرەکانتان کەسە ئازیزە ڕۆشتووەکانتان لە بیرمەکەن .. یادیان بکەنەوە بە دوعاکردن بۆیان و بە خێرکردن بۆیان ..
بە وەفا بن تەنانەت لە غیابی ئەوانیشد ..

* * *

**ڕۆژەکان بەسەرماندا تێدەپەڕن و بۆ یەك ڕۆژیش باوەڕ ناکەین کە دەژین لە دوای مردنی خۆشەویستانمان ..**
**وە دێتە سەر ساتی جیابوونەوە و بە خەم و خەفەتەوە دەگرین، ئەو کەسە لە پێش چاوومان لاناچێت، و هەستی خواردنمان لە دەست دەدین، و سەرکێشی دەکەین بە تەندروستیمان، و شتانێکی زۆر لە ژیانماندا دەگۆڕێت، و وامان لێدێت کە گرنگی بە هیچ شتێك نەدەین ، ساردیەتی دڵمان دەڕوخێنێت، تایبەتمەندیەکانمان دەگۆڕێت و جەستەمان نەخۆش دەکەوێت ..**
**لە هەر جارێك کەسێکی ئازیزم لەدەست بدەم، هەست بەم شتانە دەکەم، وە بۆ لەدەستدانی ئازیزێك یان هاوڕێیەك یان ئاواتێك!.**
**ئەم دڵە کە جارێك لاواز بوو، گەورە بوو وە تەنها بەهێزی خودا گەڕامەوە و دڵنیابوومەوە کە هیچ دابڕانێك نیە لە ژیاندا، لە هەر کاتێکدا بێت دەتوانین قسە بکەین لەگەڵ ئەو کەسانەی کە لێمان دابڕاون، دەتوانین هەر شتێك هەبێت بیکەین بۆ نوێ کردنەوەی پەیوەندیەکانمان، وە بە دوعایەك لە دڵێکی پڕ لە خۆشەویستی بۆ ئەو کەسانەی بە بێ ویستی خۆیان و بەهۆی مەرگیان جێیان هێشتووین ..**
**ئازیزان دابڕان ئەوەیە کە لە ڕۆژی دواییدا یەکێکمان پەرتووکی کردەوەکانمان بە دەستی ڕاست وەبگرین و ئەوەی ترمان بە دەستی چەپی ..**
**بە دڵت بفەرمووە کە دابڕان بوونی نیە لە دوونیا!.**

* * *

**دوای ماوەیەك لە دەبڕان ناوەكانیان نابینینەوە وەك پێشتر، دەزانم لە دوورەوە و بە بێدەنگی چاودێریم دەكەن، وە لەوانەیە چاودێریكردنەكەیان تەنها مەراق بێت!. من دەتوانم دوای ئەوان بژیم !.**

**لە دوونیای مندا خەڵكێكی زۆر هەیە!، ئایا من گۆڕاوم یان هەر لەسەر بەڵێنی خۆشەویتانم ماومەتەوە ؟!**

**من سەرم لێ شێواوە !.**

**ئایا وەفا نەخۆش دەكەوێت و خۆی دەكوژێت دوای ئەو پەیوەنیە خۆشەویستیەی كە بە جیابوونەوە كۆتایی هات، یان بارودۆخ كوشتویەتی؟**

**باشە، وە ئەگەر بەهۆی بارودۆخەكەش بێت هەر تۆزێك وەفا پێویستە بمێنێتەوە ، وەكو ڕێزێك بۆ ئەو تەمەنەی كە لەگەڵ ئەوان بەسەرمان برد ..**

**بە هەرحاڵ، ئەو خۆشەویستیە ڕاستەقینەی كە لە خودایە بۆ خودایە هەرگیز نامرێت، و بەسەر ناچێ و لە بیرناكرێ.**

**لە دوعاكانماندا یادیان دەكەینەوە، و خێریان بۆ دەكەین، و زەدەخەنە دەكەین كاتێك یادیان دەكەینەوە، وە ئەگەر وەفا لە دڵی ئەواندا مردبێت، ئەوا هێشتا دڵمان بە وەفاوە لە نەبوونیان لێدەدات !.**

***   *   ***

**ئێمە نامرین كاتێك كەسێكی خۆشەویستمان لەدەست دەدەین، بەڵكو دەژین و ڕووبەڕووی كەسانی تر دەبینەوە، وە ئەم خەسارەتە دەكەینە سەرەتایەكی نوێ و تێیدا وێنەی ژیان جوانتر و سەرسوڕهێنەر تر دەكێشین لە چاوو ئەوەی هەبوو، وە لە پێشتر بەهێز تر دەبین ..**

**باوەڕت بەوە هەبێ كە خودا [سبحانە وتعلى] هەمیشە بە كەسانێكی باشتر لەوانەی كە لەدەستماندان قەرەبوومان دەكاتەوە، بۆیە من بەهەموو سنگ فراونیەك لەدەستدان قەبووڵ دەكەم .**

***   *   ***

**ئامۆژگاریەك:**

**لەگەڵ هەر کەسێك کە خۆشتدەوێ مەڕۆ بۆ شوێنە دڵخوازەکانت، کە هەمیشە حەز لە سەردانکردنی دەکەیت ..**
**چونکە کاتێك بە تەنیا جێدەهێڵن ئیتر ئەو شوێنەت لێ دەبێتە شوێنی دڵتەنگی و خنکان، و ئاسوودەیت ناداتێ وەکو پێشتر ..**
**ئەوانت بیرەهێنێتەوە، وە دەبێتە شوێنێکی ئازاربەخش بە قەد ئەوەی کە دڵخۆشی تێدابوو!.**

* * *

**دەژین و هیچ نرخی ئەو شتانە نازانین تا ئەو کاتەی بەربەستێکمان دێتەپێش و لەدەستدانیان پشتڕاست دەکاتەوە!.**
**چەندەها شتمان لەدەستداوە لە ژیانمان کە هەرگیز رۆژێکیش پێشبینی ئەوەمان نەکردووە کە لەدەستی بدەین، وە لەدەستماندە بەهۆی گوێ پێنەدانی خۆمانەوە یان بەهۆی نا سوپاسگوزاری بۆ ئەو شتانەی کە خودا پێی بەخشیووین!.**
**بۆیە هەمیشە دووعا دەکەم: خودایە نرخی شتەکانمان پیشان مەدە دوای لەدەستدانیان!.**

* * *

**سەرەڕای ئەو دەنگە دەنگەی لە دەوروبەرمان هەیە هەست بە تەنیایی دەکەین، تەنها لەبەر یەك کەس کە جێی هێشتووین، وە لە ماوەی ڕۆژێك ترپەکانیانمان لە دەستدان، ئازار دەچێژین و پێکەنینی ناڕاست دروستدەکەین، و ڕۆتینی ڕۆژەکانمان ئاسایی دەبێتەوە، و هەموو ڕۆژێك دەبێتە دووبارەی ڕۆژەکەی پێش خۆی.**

**ئەی دڵ ئارام بە! .. بە یەقینەوە بڵێ:**

**( من وجد الله فماذا فقد ! .. وَ من فقد الله فماذا وجد!)**

**واتا: ئەوەی خودای دۆزیەوە چی لەدەست چوو! .. ئەی ئەوەی خودای لەدەستدا چی دۆزیەوە ).**

**هەر چەندێك لەدەست بدەی ئەی دڵ دەژیت!.**

**ئەو هێزەت بکە دروستکەری هەموو شتێکت لەگەڵ خودا، ئەو بە میهرەبانیەوە لەگەڵماندایە لە هەموو کات و ساتێکدا ..**

**هیچ شتێك نەبووە لەدەستی بدەین و بەهێزمان نەکات، کەواتە لەدەستدانی ئەو کەس و ئەو شتانە بەهێزمان دەکەن، وە بۆ ئەوەی بزانین کە تەنها خودا لەگەڵماندایە لە هەموو کات و شوێنێکدا، وە ئەو تاکە کەسە کە ماوە و دەمێنێت هەمیشە ، پاکی و بێگەردی بۆ خودای هەمیشە زیندوو.**

**هەندێك جار دەبێت وەك بڕوانامەی تاقیکردنەوەکان مامەڵە لەگەڵ شتەکانی دەوروبەرمان بکەین ، ناتوانین هیچی لێ بگۆڕین بۆ ڕەشکردنەوەی ئەو گۆڕانکاریانەی کە دەمانەوێت،**

**بەم شێوەیە ئەو شتانەی کە لە ژیانماندا دەڕۆن ناتوانین بیانگەڕێنینەوە، یان کارەکان بگۆڕین بۆ ئەوەی بەدەستی بهێنینەوە ..**

**بۆیە نابێت خەمبار بین بۆ لەدەستدانیان، و دەبێت ئەم شتانە لە ژیانی خۆمان ئازاد بکەین، چونکە ئەگەر هی ئێمە بێت لە کۆتاییدا دەگەڕێتەوە بۆمان، ئەوەی لە خوداوە بۆمان دابەش کرابێت بەدەستی دێنین، ئەوەشی بۆ ئێمە نەبێت هەرچیش بکەین بەدەستی ناهێنین ..**

***   *   ***

**هەنێك جار نرخی ئەو شتانە یان ئەو کەسانە نازانین کە خۆشماندەوێت هەتا لەدەستیان نەدەین، یان تا تووشی نەخۆشیەکی دیاریکراو نەبین،**
**زۆر کەس لەگەڵمان دەژین،وە بە گەرمییەوە دەست لەناو دەستی یەك دەنێین، و لە گەڵیان ڕۆژانیکی جوان دەژین، پەنجەمۆری خۆیان لامان جێدەهێڵن ،**
**دڵ پێش ئەقڵ ناتوانێت ئەو کاریگەریانە ڕەش بکاتەوە کە بە دیوارەکانی دڵمان هەڵواسراون ،**
**وێنەی ڕووخساریان لەبەردەکەین، و تایبەندمەندیەکانیان دەبینینەوە لە ڕووخساری هەموو ئەو کەسانەی ڕووبەڕوومان دەبنەوە، ئاوازی دەنگیان لەبەردەکەین، و لاساییان دەکەینەوە بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکەین، وەك ئەوی ڕۆحەکانمان بووبێت بە یەك ڕۆح لە دوو جەستەی جوودا،**
**وە خەڵکانێکیش هەن دێنە ژیانمانەوە و دەچنە دەرەوە بەبێ ئەوەی هەست بە لەدەستدانیان بکەین ،**
**بۆیە تەنها هاوڕێ دڵسۆزەکان (الخلصاء) لەبیرکردنیان قورسە، وە زۆر قورسە دەنگێك بدۆزینەوە وەکو خۆشەویستی ئەوان بێت بۆ ئێمە ..**

***  *  ***

**الخلصاء لە (*إخلاص*)ـەوە هەتووە، بە واتای دڵسۆزی و وەفا دێت.**

**کاتێك جیادەبینەوە لەو کەسانەی کە خۆشمان دەوێن و مەودایەکی زۆریان لە دڵمان داگیرکردووە، لە قوڵایمانەوە پێمان وایە کە ئەستەمە ئەو جۆرە کەسانە بدۆزینەوە لە ڕاڕەوەکانی ژیانماندا کە چیرۆکی جوانمان لەگەڵیان چنیووە ، بۆیە دەرگاکانی بەختەوەری لە بەردەممان دادەخەین، و ناتوانین درێژە بە ژیانمان بدەین بەبێ ئەوان،**
**بەڵام کاتێك ڕووبەڕووی کەسانێك دەبینەوە کە دڵە سپیەکانیان جگە لە خۆشەویستی و وەفا و هیوا و گەشبینی هیچی تری هەڵنەگرتووە، ئەوان دەتوانن بە درێژایی ڕۆژگار ژیانمان بگۆڕن ..**
**بۆیە بۆشایەکی گەورە لە دڵمان داگیردەکەن تا بیرمان لای ئەوان بێت، ئیتر دەبن بە کەشتی بیرمان کە وا دەکەن جارێکی تر خۆمان بدۆزینەوە، ئەو هەڵسوکەوتە تایبەتانەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە کە لە خۆماندایە و نازانین، ڕەنگی نوێ زیاد دەکەن بۆ ژیانمان .. دەبینە یەکێك لە بەختەوەرترین کەسەکان**
**لە نزیك ئەوانەوە ..**
**بۆیە هەمیشە قەرەبووەکانی خودا جوانترینن .**

* * *

**ئەی دڵ ئارام بە و بەرگە بگرە، هەرچەندە دەست بە شتە بەنرخەکانی دڵمان بگرین لە دۆڕان و لە لەدەستدان بیانپارێزین، ڕۆژێك دێت بە حەتمی لەدەستیان دەدەین، نیعمەتەکانی دوونیامان تا سەر بۆ نامێنینەوە، وە هێشتا لە نیعمەتە هەمیشەیەکانی بەهەشتیش نین ..**

**دەست بەو شتانەوە بگرن کە خۆشتان دەوێت، و هۆکار بۆ مانەویان ببەخشن هەستی لە دەستدان زۆر بە ئازارە، مەگەر تەنها ئەو کەسانە هەستی ، پێبکەن کە تووشی لە دەستدان بوونە .**

* * *

**هەستێکی بە ئازارە کاتێك کەسێکی نزیك لە دڵت وەکو کەسێکی بێگانە لەگەڵت قسە دەکات، دوای ئەوەی کە پێشتر گفتوگۆکانتان لەسەر هەموو شتێك بوو،**
**کاتێك پرسیاری لێ دەکەیت چۆنی؟**
**بە ساردیەکەوە وڵام دەداتەوە: باشم،؟ و بێدەنگ دەبێت ..**
**بەم وڵامدانەوە ساردەی ناچارت دەکات تۆش بە گرژومۆنیەوە بێدەنگ بیت، وە لە دڵیشتدا قسانێکی زۆرت بۆ ئامادەکردووە، و ڕۆحت لە تامەزرۆیی و سۆزەوە دەشکێنێت ..**

*   *   *

**ئێمە هەمیشە چاوەڕێی ئەو کەسانە دەکەین کە ئەستەمە بگەڕێنەوە بۆ ژیانمان، سەرەڕای ئەوەی کە زۆر کەسی تر هەن لە ژیانمان ..**
**بەڵام هەمیشە دڵ ویستی شتی مەحاڵی هەیە ..**

*   *   *

**کاتێك هەموو شتێکی خۆمان دەدەینە ئەوانی تر دەبێت هەوڵبدەین لەو کەسانە بن کە نرخی ئەو شتانە بزانن کە لە دەستیان دەچێت ، و فڕەیی نەدەنە ناو زبڵدانەکانیان، بەڵکو پارێزگاری لێ بکەن ..**
**بۆ ئەوەی ئەو شتە بە نرخانە لەدەست نەدەن کە خۆمانمان لێی بێ بەش کردووە . وە تەنها ئەوان نین کە لە دەستی دەدەن .. بەڵکو ئێمە زیاتر لە ئەوان خەسارەتمەند دەبین ..**
**زۆرجار کاتێك ئەمانەوێت واز لە شتێك بهێنین، بە دەستی دەهێنین،**
**ئەوەی دەتەوێت لە دوورەوە دەیەوێیت، هەر کاتێك واز لە شتێك یان ئامانجێك بهێنیت و بە جێی بهێڵی ئەو زیاتر لێت نزیك دەبێتەوە!..**

*   *   *

**کاتێک دەمانەوێت شتێکی ئازیز لە دڵمان بپارێزین، یان بە شێوەیەک دەیپارێزین کە هەموو خەڵکی ببینێت و بە ئاسانی بیدۆزینەوە، یان بە شێوەیەک دەیپارێزین کە کاتێک خۆشمان ویستمان نەیدۆزینەوە !..**

***   *   ***

**کاتێک منداڵ بووم دایکم پێی ئەوتم ئەو خواردنەی کە لە ئێمە دەکەوێت شەیتان دەیلێسێتەوە، گەورە بووم و ئەوە فێربووم کە زۆرێك هەن لە پێش چاومان دەکەون و هەرگیز وەکو خۆیان لێ نایەتەوە .. هەموو شتێکی جوانیان تێك شکاند و وێرانیان کرد، و ئێمەش لە دڵی خۆمان فڕێمان دانە دەرەوە ..**

***   *   ***

**دڵەکان بە خۆشەویستیەوە لێدەدەن***

لێی پرسی خۆشەویستی لە چاو تۆدا چیە؟ وڵامی دایەوە: خۆشەویستی لە چاوی مندا کردارە نەك تەنها قسە، دەتوانم لە ڕۆژێکدا یەك ملیۆن جار وشەی (خۆشمدەویی) ـت پێ بڵێم، گوێیەکانتی لێ تێر بکەم، وە دەتوانم ئەو وشە شیرین و میهرەبانەت پێ بڵێم کە مانای خۆشەویستی دەگەیەنێت، بەڵام من باوەڕم وایە خۆشەویستی دوعاکردن و خێرکردنە .. ئەی تۆ چی؟ دەزانیت؟ .. لەو کاتەی تۆم خۆشویستووە چۆنیەتی ویردەکانم (زیکرەکانم)گۆڕیووە .. ئەی چۆن ئەیکەیت ئێستا؟ من ئێستا دەڵێم: ( استغفرالله لي و لها، اللهم اغفرلي و لها )، واتا: لە خودای گەورە داوای لێخۆشبوون دەکەم بۆ خۆم و ئەو، خودایە من و ئەویش ببەخشە. خۆشەویستی ئەوەیە کە کەسە ئازیزەکانمان لەخودا نزیك بکەینەوە، تا لەگەڵ خۆمان بیان بەین بۆ بەهەشت، هەمووان لە گۆڕەپانەکەداین، و دەزانین دونیا کۆتایەکەی هەر نەمانە، ومانەوەی هەتاهەتایی لەگەڵ ئەوانەی خۆشماندەوێن لە قیامەتدا.
ئایا تا ئێستا بیرت لەوە کردۆتەوە لەگەڵ خۆشەویستانت بیت لە بەهەشت؟ وە خودای گەورە بەڵێنی چی پێ داویت لەگەڵ خۆشەویستانت؟ ..

* * *

کاتێك یەکێك پێمان دەڵێت: دڵەکەم، ڕۆحەکەم، چاوەکەم، ژیانی من .. ئایا هەر بە ڕاست مەبەستیان ئەوەیە؟ یان هەر تەنیا وشەیەکی سەر زارەکیە؟ خەڵکانێك هەن بە دەست هەژاری سۆزداریەوە دەناڵێنن، ئەوان دەستیان بەو قسە جوان و میهرەبانانەوە گرتووە، و پێش خەوتن بیری لێدەکەنەوە وپێدەکەنن .. ڕەنگە وا بیر بکەینەوە ئەم وشانە زۆر ئاسایین، بەڵام با تۆزێك بیربکەینەوە .. چی کەسێك بە ڕاستی شایەنی ئەوەیە ئەم قسانەی پێ بڵێیت؟. ئایا هەست و سۆزمان خۆڕاییە بۆ هەموو کەسێك تا ئاوا بیڵێین؟. ئەو وشانە پێویستە بە کەسانێك بگووترێت کە نیشتەجێی ڕۆحمانن؛ چونکە ئەو کاتە سۆزت بۆی دەبێت ..

* * *

## دڵەکان بە دوای خۆشەویستیەوە دەگرێن*

وەك چۆن خەمی خوشکەکەتە و ئەترسی شتێکی لێ بێ، بۆ کچی خەڵکیش ئاوا بە، قسە مەکە لەگەڵیان بۆ ڕابواردن بەناوی خۆشەویستی!.
ئەگەر بە حەڵاڵی کچێکت خۆشدەوێ، بچۆ بۆ دایکتی باس بکە، بەو شێوەیەی حەزت لێیە ڕێز لە خوشکەکەت بگیرێ، ڕێزی لێ بگرە، کێ ڕێزیان لێ بگرێ بەخشندەیە، چۆن هیوا دەخوازیت کە خودا هاوسەرێکی باش بە خوشکەکەت ببەخشێت، تۆش هاوسەرێکی باش بە بۆ ئەو ئافرەتەی هاوسەرگیری لەگەڵ دەکەیت .

دڵت لە پەیوەندیە کاتیەکان بپارێزە، هەندێك کچ بەهرەیان هەیە لە دزینی دڵ و جێهێشتنیان .. کاتێك گوێم بۆ کچەکان دەگرد، و هەوڵم دەدا ئامۆژگاریان بکەم و هیوا لە دڵەکانیان بچێنم، زۆر دوعام لێیان دەبیست لەو کەسانەیان دەکرد کە دڵخۆشیان کردن و دواتر جێیان هێشتوون، وە ئەوان ڕەنگە لە بارودۆخی ئەو کەسانەش بێ ئاگا بن یان لە هەوڵەکانیان بۆ پەیوەندی کردن پێیانەوە ،
تەنیا خودا بەو چیرۆکە شاراوانە دەزانێت کە دەمرن و لەناو دەچن دوای تەمەنێك ژیان ..
بۆ ئەوەی ویژدانت ئاسوودە بێت، دڵت تەنها ببەستەوە بە خودا، پەیوەندیە کاتیەکان لە بیربکە، ئەوانە چەند تاوانێکی ڕۆیشتوون لە دەفتەرەکەت،
کەسێکی بەڕێز و باش بە، بۆ ئەوەی خودا هاوسەرێکت پێ ببەخشێ کە هەموو کاتێك دڵت لە بوونت و نەبوونیشدا بپارێزی ..

* * *

**خۆشتدەوێ ..**
**ئەویش لە سەوجدەدا دوعای کرد: خوایە گیان ئەگەر خێری تێدایە بۆم ئەوا نزیکی بکەرەوە لێم، وە ئەگەر خراپەی .. ( بێدەنگ بوو، و نەیتوانی دوعاکەی تەواو بکات، وە فرمێسکەکانی درێژەیان بە دوعاکەیدا )، خوایە گیان ئەگەر خێری تێدایە بۆم ئەوا نزیکی بکەرەوە لێم، وە ئەگەر خراپەی تێدایە بۆم ئەوا چاکی بکەیت و باشی بکەیت بۆ دڵم ..**

* * *

**ئافرەتێکی خێزاندارە و لەگەڵ کەسێکی تر جگە لە هاوسەرەکەی لە یەکێك لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان قسە دەکات، وە دەڵێت هاوڕێمە، و پەیوەندیەکەمان لە سنوری هاوڕێیەتی دەرناچێ، وە ئەگەر پێی بڵێم: ئایا هاوسەرەکەت بەم پەیوەندیە هاوڕێیەتیە دەزانێت؟ پێم دەڵێت: دەتەوێت ماڵم بشەوێنی!**
**نازانم کێیە خەریکە ماڵی کێ دەشەوێنێ ! ..**
**تەنانەت ئەگەر مێردەکەی کەمتەرخەم بێت لە ڕووی، ئەو دەتوانێت هەموو شتێک ئەنجام بدات، جگە لەوەی لە نەبوونی ئەودا پشتی بشکێنیت و خیانەتی لێ بکات، با ڕاستگۆ بێت و گرنگی پێبدات لە جیاتی قسەکردن لەگەڵ کەسی بێگانە، بۆ ئەوەی گلەیەکانی بۆ خودای خۆی یان دایکی باس بکات ..**
**خودا دڵتی پاراستووە بەوی هاوسەرێکی پێ بەخشیووی، و ماڵ و منداڵی لە نەبوونی مێردەکەتدا پێ سپاردووی ..**
**دەزانیت کە پەیوەندیت لەگەڵ پیاوێك جیا لە هاوسەرت تاوانە، تەنانەت ئەگەر قسەکردنیشتان بەس لە ئەنتەرنێت بێت، لەگەڵ ئەوەشدا کاتی خۆش بەسەر دەبات لە نەبوونی ئەودا، وە هاوسەرە هەژارەکەشی ئیش دەکات لە پێناو ئەوەی دڵخۆشی بکات، و ژیانێکی خۆشی بۆ بونیاد بنات، و دەترسێت کەمتەرخەمی لە مافەکانی بکات ..**

**نادادپەروەرانەیە کە ژن نەبوونی مێردەکەی لە ماڵەوە بقۆزێتەوە بۆ ئەوەی تاوان بکات لە ماڵەکەیدا!**
**من شتێك دەزانم، ئەویش ئەوەیە کە متمانە و ڕێز ئەگەر لەناو بچن بەهۆی**

پەیوەندیەکەوە، ئەوا هەرگیز ئەو پەیوەندیە وەکو جارانی لێ نایەتەوە، هۆکارەکانیش هەر چی بن!..

خۆشی دەویست و خۆشەویستیەکەی لەگەڵیدا ئاڵوگۆرکردەوە، وە لەگەڵیدا چیرۆکێکی خۆشەویستی ژیا .. لە چاو ئەوان چیرۆکێك بوو جیاواز لە هەموو داستانەکانی دونیا .. و چارەنووس تووشی شۆکی کردن کە لێکی جیا کردونەتەوە، دوای چەند ساڵێك چاویان بەیەك کەوتەوە، بۆیان دەرکەوت کە یەکێکیان ژیانی بە تەواوی بەسەر بردووە .. ئەوەی تریان بە تەواوی ژیانی لە دەستداوە ..!!
ئەو خۆشەویستیەی بۆ خودا نەبێت، خێری تێدانیە،
ئەگەر حەڵاڵی یەك نەبوون و هەوڵ بدەن لە خودا بترسن، و لە تاوان دووربکەونەوە، و خۆشەویستیەکەتان واز لێ بێنن بۆ خودا، تا دەبنە حەڵاڵی یەکتر .. دڵنیاببنەوە لەوەی کە چیرۆکەکەتان سپێردراوە بە پەروەرێنەکەتان ، پەروەردگارتان بە باشتر پێتان دەبەخشێتەوە ..
ئەو میهرەبانە بە دڵەکانمان، و دەزانێت چ گونجاوە و چ شایەنی ئێمەیە ..

* * *

ئەی کچ لە دڵتەوە بمخوێنەوە ..
کێ تۆی خۆشبوێت پارێزگاری لە گەوهەرەی ناوەوەت و پاکیەکەت دەکات، هەڵسووکەوتی هەڵاتن و گومان بردن بەکارناهێنێ، بێزاربووین لە بیستنی چیرۆکی ئەو ئافرەتانەی کە دەڵێن، ماوەیك پەیوەندیمان هەبوو بەڵام دواتر جێی هێشتم ..
دڵێك کە لە خودا ناترسێت، و ناتپارێزێت، ئایا تۆ پێویستت پێیەتی ..
هەستەکانت بە لاوە بنێ، و بە مێشکت بیربەکەوە، ئاساییە ڕۆژێك، مانگێك، ساڵێك ئازار بچێژی، و بۆ هەموو تەمەنت بحەسێیتەوە، بژێویتان بە دەست خوداوەیە، نەك دەستی مرۆڤ، خودا ئەوەت پێ دەبەخشێت کە شایستەی دڵتە، ئەگەر بەڕاستی ئەوت خۆشدەوێ، بۆ خودای جێ بهێڵە، ئەگەر ئەو دڵسۆزانە تۆی خۆشبوێت، وازت لێ ناهێنێت و دەستبەردارت نابێت تا بە حەڵاڵی دەبیتە هاوسەری، وە ڕێزت لێ بنێت بەوەی پەنجەت جوانتر بکات بە تێکردنی ئەڵقەیەك لە بەردەم هەمووان بە ڕەزامەندی خودا و دواتریش خانەوادەکەت و

خانەوادەکەی ..
پێم دەڵێیت: گفتۆگۆی ئێمە ئاساییە و لە سنور تێ ناپەڕێ ..
منیش پێت دەڵێم: شەیتان لەناو ئەو دەمارانەیە کە خوێنی پیادا هاتووچۆ دەکات..
ئەو کەسانەی کە خۆشتاندەوێن لە خودا بترسن بۆیان، سەرپێچی و تاوان مەکە،
وە مەهێڵە تووشی تاوانت بکەن ..
لە چاوو خۆتدا گەورە بە و بەهێز بە، بەهۆی مرۆڤەکانەوە خودا لە خۆت
دڵگران مەکە، دەست لە مافێك لە مافەکانی خودا هەڵمەگرە لە پێناو کەسێك کە
ڕەنگە بەجێت بهێڵێت ..

*   *   *

کەسێك هەیە ..
گرنگی دەدەین لە بەدواداچوون بۆ هەوڵەکانی، و لە دوورەوە چادێری دەکەین،
و هەمیشە دوعای بۆ دەکەین، حەز دەکەین ئەو خۆشەویستیەی کە لە دڵماندایە
پێی ڕابگەیەنین .. بەڵام دەترسین ڕازی نەبێت بە پێشنیاری
خۆشەویستیەکەمان، یان دەترسین خودا لە خۆمان دڵگران بکەین، بۆیە لە
ترسی خودا لێی دووردەکەینەوە ..
بیر لە خۆشی و ناخۆشیەکانی دەکەینەوە، و گرنگی بە هەستەکانیان دەدەین
بەبێ ئەوەی قسەشی لەگەڵ بکەین ..
هەموو شتێك دەکەین بۆ ئەوەی ئەو کەسەی خۆشماندەوێت هەواڵمان ببیستێ ..
کاتێك شتێی نوێ دەکەین، کاتێك سەردەکەوین، کاتێك شتێکی مەحاڵ بەدەست
دەهێنین، کاتێك لەبارەی ئەوان و خۆمان دەنووسین ..
تەنانەت ئەگەر دوریش بێت لێمان .. و هیچ شتێك لەو هەواڵانە و ئەو گرینگی
پێدانە نەبیستێ ..
بۆ ئەوەی دڵت ئارام بێتەوە، باسی ئەو کەسە لەگەڵ خودا بکە و
بۆ ئەوی واز لێ بهێنە .. و بە حەڵاڵی لێی داوای بکە ..
خودا پێت دەبەخشێت یان لەوە باشترت پێ دەبەخشێت ئەگەر شایەنت بێت

*   *   *

**تارمایی کاتی***

**بە خۆشەویستیەکی بێ وێنە خۆشماندەویستن ..**
**گرینگترین شت بوون لە ژیانماندا ڕۆژێك لە ڕۆژان، و سەرنجمان لەسەر دڵخۆشی ئەوان بوو، و چەندین هەڵوێستە و یادگاری لە نێوانمان ڕوویاندا، گرنگی خۆمان لە ژیانییاندا دەردەبڕین، ئەوان دەتوانن هەموو شتێکی جوان بن لە ژیانماندا، بەڵام ئێمە کێین بۆ ئەوان؟ ..**
**بڕیار دەدەین لێیان دووربکەوینەوە، و بەهێز بین بۆ خۆمان،**
**ڕۆژگار دەڕوات، و بەڕێکەوت ئەکەوێتە بیرمان و دەڵێین: چۆن هەموو ژیانمانیان داگیرکردوو و ئێمەش هیچ نەبووین بۆ ئەوان ..**
**ڕۆژە جوانەکانمان بە بیردێتەوە و زەردەخەنە دەکەین و دوعایان بۆ دەکەین ..**
**پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی هەستەکانی دروستکردووە و**
**هەر ئەویش لای دەدات ..**

*** * ***

**ڕەنگە دوای پەیوەندیەکی بەهێز خۆشەویستان لەیەك جیاببنەوە، هەر یەکێکیان دوای ئەوەی نزیکترین کەسی یەك بوون دادەبڕێن و لە یەك دووردەکەونەوە ..**
**ئایا ناپرسیت: خۆشەویستی بۆ کوێ دەڕوات دوای مردن؟ ..**
**دەنێژرێت و لەبیردەکرێت؟**
**یان دەگۆڕێت بۆ ڕق و کینەیەك بە قەبارەی ئەو خۆشەویستیەی**
**کە هەبوو یان زیاتریش !..**

*** * ***

**من لێرە نیم بۆ پڕکردنەوەی کاتە بەتاڵەکانی کەسێك، هەر کەسێك منی خۆش بوێت هەر چەندە سەرقاڵیش بێت ئەوا پەیوەندیم پێوە دەکات و قسەم لەگەڵ دەکات.**
**بۆ ئەو هاوڕێیەی واتای زۆری هەبوو بۆم، خولەکێك لە هەواڵ پرسینت و گرینگی پێدانت پێم بەس بوو بۆ هێنانی خۆشی بۆ دڵم ..**
**بەڵام ئێمە لە بەسەر بردنی کاتەکانمان و هەستەکانمان بۆ کەسە خۆشەویستەکانمان زۆر حەسوود و چاوچنۆکین!**
**ڕەحمەت لەو ڕۆژانەی کە دەمانگووت: گیانمان وەك سەربازە،**
**هیچ شتێك نەگۆڕاوە هاوڕێ جگە لەوەی کە هەست بە یەکتر دەکەین، بەڵام ئێستا زۆر دووریشین لە یەکتر!**
**ووتمان: بە ویستی خۆتان دووربکەونەوە،**
**وە لە ناخیشماندا خۆشەویستیەك هەبوو خۆزگەی دەخواست لەگەڵمان بمێننەوە بە دێژایی تەمەن، دوای چەندین ساڵ ئێمەیان بیردێتەوە و هەست بە پەرێشانی دەکەن بەهۆی لە دەستدانی ئێمەوە، بەتایبەتیش کاتێك شتێکی نوێ دەکەین و توانای ژیان و خۆگونجاندمان هەیە لە دووری ئەوانەوە، دەگەڕێنەوە بۆ لامان، بەهۆی مەڕاق یان (فزوڵی) خۆیانەوە نەك خۆشەیستیان،**
**کێشە نیە گەر شتێکیان فێربکەین لەو هێزەی کە بەدەستمان هێنا دوای ئەوەی بەجێیان هێشتین، وە باوەڕ بەوە بێنن کە بە کردەووە چاکەکانمان ئێمە لە هەمووان باشترینین ..**

*   *   *

**زیندووبوون لە ژیانماندا، لەناکاو وون دەبن و وەکو مردووەکانیان لێدێت، هیچ دەنگێك و هیچ وشەیەکیان لێوە نایە!**
**تەنها بارودۆخی خۆیانمان پێ ڕادەگەیەنن و دەڕۆن، و دڵێکی پڕ لە ئاگر و پڕ لە تاسەوە لەدوای خۆیان بەجێدەهێڵن ..**
**تکایە یادگارییەکانتان لەگەڵ خۆتان ببەن پێش ئەوەی بەجێمان بهێڵن، وە نەگەڕێنەوە،**
**لە دووری ئێوە دەژین و بە بەجێهێشتنتان بەهێزتر دەبین ..**
**ڕۆژیك دێت دەگەڕێنەوە و ئێمەیان خۆشتدەوێتەوە، و ئێمەش ناگەڕێینەوە بۆ لایان و گرنگیان پی نادەین ..**
**ئەوەی دەیەوێت بەجێمان بهێڵێت با هەر لە سەرەتاوە دەستپێنەکات کە دەزانێت لە کۆتایەکەیدا بەجێماندەهێڵن، دڵی بچووکمان بەقەد هەموو جیهان ئازار دەچێژێت، ئازارمان مەدەن و بەجێمان بەهێڵن ..**
**لەو کەسانە خۆش نابین کە بە ئەنقەست ئازاری دڵمنیان داوە و ڕۆیشتوون! ..**
**وە ڕۆژێك دێت خودا پرسیارتان لێ دەکاتەوە لەسەر ئەو ئازارانەی کە لە دڵماندا دروستان کردووە ..**

*** * ***

**هەموو شەوێك دەگریاین بۆ لەدەستدانیان و بۆ یادگاریەکانیشیان کە لە سندوقی یادەوەریەکانماندا بەجێیان هێشتتبوو، وە لە شەرما دەستمان لەسەر دەممان دادەنا بۆ ئەوەی کەس دەنگی لاوازی و تامەزرۆیمان نەبیستێت ..**
**ڕۆژگار بەسە بۆ ئەوەی مرۆڤی بەهێز دروستبکات .. ڕۆژێك دێت پێدەکەنین و زەردەخەنە دەکەین بۆ ئەو شتانەی کە ئێمەیان خستۆتە گریانەوە، هەستێکی خۆش دەبێت کاتێك بیردەکەینەوە کە ڕۆژگارێکی سەختمان بەڕێ کردوو و ئێستا تەنها بۆتە یادەوریەك و وانەیەك بۆمان! ..**
**ئێمە تەنها خودامان هەبێت بەسە ..**

*** * ***

**بڕوایان بەو خۆشەویستیەی ئێمە هەیە، و بە ئەنقەست ئازاری ڕۆحمان دەدەن بە ڕۆیشتنیان، خۆیان بە ووتنی بارودۆخ سەرقاڵ دەکەن ..**
**ببورن، بەڵام نەبووە و ناشبێت بارودۆخ هۆکاری لەیەك جیابوونەوەی خۆشەویستان بێت! .**
**ئەوە ئێمەین کە بارودۆخی خۆمان دروستدەکەین، وە هەر خۆشمانین کە بڕیاری مانەوە یان ڕۆیشتن دەدەین!. بارودۆخ نابێتە بڕیاردەرمان! ..**
**چ بارودۆخ و هەلومەرجێکە، ئەوە تەنها بەهانەیە بۆ ڕۆیشتن!..**

* * *

**داواکاریەکی بچووك بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە خۆشمدەوێت و دەیناسم ..**
**تکات لێ دەکەم، ئەگەر ویستت بچیتە دەرەو لە ژیانم هەواڵم پێ بدە پێش ئەوەی بڕۆیت، لەناکاو وون مەبە بەبێ ئەوەی پێم بڵێیت کە دەڕۆیت! ..**
**هیچ کتێبێکی جادوویی بچووکم نیە فێرم بکات چۆن لە دەریای دونیادا دێژە بە ژیان بدەم بەبێ خنکان!..**
**مافی ئەوەم هەیە کە هەست بە ئاسوودەیی بکەم، بەوەی کە ڕازی بم یان بە ئاگا بم لە بڕیاری ڕۆیشتنەکەت نەك تووشی سەرسوڕمانم بکەیت! ..**
**تەنانەت لەسەر ڕۆحیشم مافت هەیە، ڕۆژگارێك لەگەڵ من بووی، ڕۆژەکانم لەگەڵتدا هاوبەشی پێکردی، خۆشی و ناخۆشیەکانم لەگەڵ بەشکردی،**
**کاتم پێویستە بۆ ئەوەی بیرۆکەی ڕۆیشتنت قەبووڵ بکەم، دوای ئەوە بڕۆ ..**

* * *

**ئەو کەسانەی کە بە پەرۆشیەوە چاوەڕێمان دەکردن .. هەموو کاتێك لەگەڵ خۆماندا باسماندەکردن .. ئێمەیان دەحەساندەوە، و وایان لێ دەکردین کەسێکی جێگیر بین .. خۆشماندەوێن و خەونی هەمیشەییان پێوە دەبینین ..**
**ئەوان لە ناخی دڵمادا نیشتەجێ بوونە، وە ئێمە دەزانین کە هیچ شتێك نین بۆ ئەوان جگە لە کەسێکی تێپەڕبوو بە ڕێگای ژیانیاندا .. لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە لە خۆش ویستنیان هەر دەمێنینەوە، وە لە قوڵای ناخیشماندا دەخوازین تەنانەت بۆ یەکجاریش بێت ئێمەیان بیربێتەوە! ..**

* * *

هەڵەت کرد .. کێشە نیە داوای لێبووردن بکە ..
کەسێکت بە قسە بریندار کردوە .. دەتوانیت دۆخەکە چاك بکەیتەوە ..
بیری کەسێکت کردووە .. نامەیەکی بۆ بنێرە یان پەیوەندیەکی پێوە بکە و پێی ڕابگەیەنە کە چەند بیری دەکەیت ..
کەسێکت خۆشدەوێ .. خۆشحاڵی بکە بە دەبڕینی خۆشەویستیت بۆی بە حەڵاڵی .. وە ئەگەر دڵتی ڕانەگرت ئەوا بە هێواشی و بە نەرمیەکەوە لێی دووربکەوە .. ڕۆڵی مرۆڤێکی سەنگین مەژی کە خۆی لە زۆر شت بێ بەشدەکات ..
ئێمە تەنها یەك جار لەم جیهانەدا دەژین، وە ڕۆژێك دێت خۆزگە دەخوازین ئەو شتانە چاک بکەینەوە کە ئەنجامانداوە، بەڵام ئەو کاتە ناتوانی هیچ شتێك بکەیت؛ چونکە ڕۆژەکان بە پەلە دەڕۆن و ناگەڕێنەوە ..

*    *    *

بێدەنگ دەبم، نەك بەو شێوەیەی بیری لێ دەکەنەوە کە بێتوانا بم لە وڵامدانەوەیان، بەڵکو لەبەر ئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان خۆشمدەویستن سەرەڕای هەموو ئەوانەشی کە هەیانبوو، وە لەبەر ئەوەی دڵخۆش بووم بە هاودەمییان، بە وەفا دەبم لەگەڵیان تەنانەت ئەگەر نرخی ئەوەش نەزانن، هەموو مرۆڤێك بە پێی ئاکار و لەسەر بنچینەی خۆی دەڕوات ..

*    *    *

بۆ ئەوانەی بەڵێنیان پێداین و جێبەجێیان نەکرد ..
بۆ ئەوانەی درۆیان لەگەڵ هەستەکانمان کرد و میهرەبانی دڵمانییان قۆزتەوە ..
ڕۆژێك دێت و خودا هەستی لە دەستدان و دڵتەنگیتان پێ بچێژت بەهۆی درۆکانتان لەسەر دڵە بێتاوانەکانمان کە ڕق لە خۆ ناگرێت ..
ئایا لەو ڕۆژانە ناترسن کە خودا پرسیارتان لێ دەکات لەسەر دڵمان وە دەربارەی ئەوەی بۆ چی شکانتان! ..

*    *    *

**گوڵەکانی جیهان***

**سوکایەتی و گاڵتە بە خەونی منداڵەکانتان مەکەن هەر چیەك بێت، ئەوان منداڵن و نازانن کە ڕەنگە ئەم خەونانە مەحاڵ بێت چ لە ڕووی ماددیەوە بێت یان لەبەر ئەوەی لە خەیاڵەکانیاندا زۆر دوور ڕۆیشتوون، هەموو ئەو شتانەی کە بیری لێدەکەنەوە یەکسەر پێتان دەڵێن، ئەوان خەون دەبینن وە بڕوایان وایە کە ڕۆژێك لە ڕۆژان بەدەستی دەهێنن ..**
**وازیان لێ بێنن با خەون ببینن، وە هانیان بدەن، وە لەگەڵیان باسی وردەکاری خەونەکانیان بکەن و پرسیاریان لەبارەیەوە لێ بکەن، بۆ ساتێکیش بێت سەرنجیان بدەن، وایان لێدێت کە ئاشنای دانیشتن و قسەکردن لەگەڵتان بن، ڕەنگە تۆ ببیت بەو مۆمەی کە لە گەنجیدا ڕێگیان ڕۆشن دەکات و بەهێزیان دەکات بۆ گەیشتن بۆ ئەو شتانەی کە خولیایان دەکەن ..**

* * *

**منداڵەکەم سزادا لەبەر ئەوەی قسەی نەشیاوی دەکرد،**
**چەند ڕۆژێك دوای ئەوە لە کاتی توڕەبوونمدا، خۆم بینیەوە کە خەریکە ئەو وشانە دەڵێم کە منداڵەکەم پێی دەگووتم!.**
**کێ شایەنی سزادانە!..**
**من هەڵەم کرد لە مافی منداڵەکەم؛ چونکە منداڵەکەم لە کردەووەکانم فێردەبێت نەك قسەکانم!.**
**ڕەنگە پەروەردەی بکەم بە زۆر وشە، بەڵام جێبەجێکردنی کردارەکانم لە بەردەمیدا هەموو وشەکانم لە مێشکی تێکدەدات!..**

* * *

**چەند پێویستمانە بچینە ناو قوتابخانەی منداڵان و فێربین، لەوێدا دڵەکان هیچ شتێك هەڵناگرن جگە لە خۆشەویستی، هیچ جێگایەکیان لە دڵدا نیە بۆ ڕق و کینە و بوغز، فەرهەنگیان وشەی ساختە لە خۆ ناگرێت، ئەوە بەسە کە درۆ ناکەن و گاڵتە نازانن ..**
**خەم ناخۆن بۆ ڕزق و ڕۆزی و بژێوی ژیان، ئەوان وەك ئێمە بێزاری دەرنابڕن بە دەست نەخۆشیەکانیانەوە، بێ تاوانی لەسەر ڕووخساریان دیارە، پێکەنینی بەردەوامیان هەیە،**
**هەندێکجار منداڵ هەندێك شت دەکات کە ئێمەی پێ سەرسام دەکەن ..**
**کاتێك دوو منداڵ بە شەڕ دێن، پەلەدەکەن لە ئاشتکردنەوەی یەکتری، ئەو ناکۆکیانە لەبیردەکەن کە بۆتە هۆی شەڕکردنیان، بە پێچەوانەی ئێمەی گەورە، هەندێکجار ناکۆکیە بچووکەکان گەورە دەکەین، و کێشە دروستدەکەین، و هەر وا بە ئاسانی لەبیری ناکەین .. بەڵام ئەوان زەردەخەنە لە لێوەکانیان جیانابێتەوە، و پێکنینەکانیان لە قوڵایی دڵیانەوە دێتە دەرەوە، بە ڕاستگۆیانە ئەوانی تریان خۆشدەوەێ، باشترین نموونەن بۆ بەخشین و دەست بڵاوی و دڵ گەورەیی، ئەوان دەبەخشن بەبێ ئەوەی چاوەڕێی وڵام بن، هیچ جێگایەك نیە بۆ ململانێ و نیگەرانیەکانی ژیان لە دڵیاندا،**
**یەکێك لە جوانترین شتەکانی دوونیا بوونی منداڵە تێیدا ..**
**خۆزگە دڵمان هەڵگری واتاکانی دڵی منداڵ بووایە ..**

***   *   ***

**خەریکی پەرەستش بووم، منداڵێکی بچووك کە تەمەنی پێنج ساڵی تێپەڕنەدەکرد بوو پێی ووتم: تکات لێدەکەم با منیش لەگەڵتدا پەرستش بکە و یادی خودا بکەم تاوەکو پێکەوە بچینە بەهەشت، من نامەوێت بچمە دۆزەخەوە ..**
**زۆر پێی سەرسام بووم، منداڵێکە و بیری لە ڕۆژی دوایی دەکاتەوە، و بیر لەوە دەکاتەوە کە ئەکەوێتە چی شوێنێکەوە لە دواڕۆژدا! .. ئەی ئێمەی گەورەکان بیر لە چی دەکەینەوە، بۆ کوێ ڕۆیشتین!..**
**بێ ئاگاین و نازانین بە چی جۆرێك دەمرین، ئایا کۆتایەکی باش یان خراپ ، ئایا بەرەو بەهەشت یان بەرەو دۆزەخ دەڕۆین ؟ ..**
**دڵمان چۆنە لە پەرستنی خودا، ئایا کاتێك یاد و زیکری خودا دەکەیت بە دڵ و بە زمان دەیکەیت، یان تەنیا زمانمانی پێ سەرقاڵ دەکەین بەبێ ئاگا لێ بوون!..**

* * *

**ئاواتێك بۆ لەناو چوونی كەسێك***

**كەسێك كە هیوا دەخوازم لەناو بچێت ..**

**ئەو كەسەی خۆی بە گەورە دەزانێت وە پێیوایە كە كۆنترۆڵی بەسەر هەموو شتێكدا هەیە، وە ئەوە نابینێت كە ئەوان بێ ئەو كێن .. ئایا دەبێت لووتبەرز هەست بە چی بكات كاتێك خۆی بە گەورە دەزانێت و دڵی غرور دەیگرێت! ..**
**ئەو زاتەی تۆی دروستكردووە لە قوڕ، هەر ئەو زاتەیە كە منیشی لە قوڕ دروستكردووە، ئەوەی ڕزق و ڕۆزی بە من و بە تۆش دەبەخشێت هەر خودایە.**
**خودا ئێمەی لە دروستبوودا یەكسان كردووە، هەر پلەیەكت هەبێت ( پزیشك ، پرۆفیسۆر ئەندازیار ... ) گۆڕەكەمان بەهەمان شێوە دەبێت ..**
**ناچێتە بەهەشتەوە ئەوەی لە دڵیدا بە قەد گەردێك لووتبەرزی تێدابێت!..**
**ئەی چی لەبارەی گەورەترین گەردد !..**
**مافی ئەوەت نیە لوتبەرزی بكەیت بەسەر ئەوانی تردا لەبەر ئەوەی تۆ دەخوێنیت، چونكە خودا توانای ئەوەی هەیە هەموو شتێكت لێ بسێنێتەوە.**
**تۆ نازانیت بارودۆخی ئەوان چۆنە، و هۆكاری بێبەشبوونیان لە خوێندن چیە، هەر تاكێكمان لەم كۆمەڵگایەدا جێدەستی خۆمانمان هەیە لە كرێكاری خاوێنكردنەوە، بۆڕی چی، ئاسنگەر، پزیشك ... هتد هەمووان ڕۆڵ دەبینن لە بونیادنانی زەوی ..**
**هەندێك خەڵك وای لێ هاتووە كە خۆی بە گەورە بزانێت تەنها لەبەر ئەوەی بڕوانامەی هەیە! .. وەك وتراوە: كەس خۆی بە گەورە نازانێ مەگەر ئەوانەی زەلیلی و بێ سەروبەری لە خۆیان بدۆزنەوە ..**

***  *  ***

**کەسێك کە هیوا دەخوازم لە ناو بچێت:**

**کاتێك لە زانکۆ تاقیکردنەوەم هەیە وگەشبینم بە خۆم، کەسێك دێت و پێم دەڵێت: تۆ تاقیکردنەوەت هەیە و کەچی پێدەکەنیت و زەردەخەنە دەکەیت!..**
**چەند کەس هەن لە کۆمەڵگاکەی ئێمەدا شتەکان قورس دەکەن وورەی خەڵکی سارد دەکەنەوە، ئەو نیگەرانە بەهۆی تاقیکرنەوەکانەوە بەڵام ئەو مافی ئەوەی نیە کە ئەو قەلەقیە و نیگەرانیەی بڵاوبکاتەوە بۆ ئەو کەسانەی کە ڕووبەڕووی دەبنەوە، خەڵك حەز لەو کەسانە دەکەن کە شتەکان ئاساتر دەکەن، و گیانی گەشبینیان پێ دەبەخشن کە دەتوانن شتەکان بە متمانەوە تێپەڕێنن ..**

* * *

**کەسێك کە هیوا دخوازم لە ناو بچێت:**

**ئەو کەسەی بە خەڵك دەڵێت دەتوانێت شتەکانیان چاك بکاتەوە، بە تواناکانی خۆی هەڵدەدات لە چاکردنەوەیان وە بانگەشەی زانین و تێگەیشتن دەکات، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو چاکی ناکات بەڵکو خراپتری دەکات! ..**
**ئەم چینە خەڵکە لە کۆمەڵگادا زۆرن، ئەوان شتەکان بونیاد نانەن بەڵکو لە ناوی دەبەن ..**

* * *

**کەسێك کە هیوا دەخوازم لە ناو بچێت:**

**هاوڕێیەکی نزیك کە لەگەڵتایە و هاوڕێ نزیەکەکانی تریشت دەناسێت، ئەچێتە ژیانیانەوە، و خۆیانی پێ دەناسێنێت ، لەگەڵ ڕۆژگار دەبن بە ئازیزترین هاوڕێیان، بەوەشەوە ناوەستن بەڵکو وێنەی هاڕێکەی لە بەردەم هاوڕێکانی تریدا دەشەوێنێت!..**
**ئاساییە و کێشە نیە بۆ دڵت .. ئەگەر ئەوان وەکو ئەوەی کە دەیڵێن خۆشیان ویستبایت ڕێگایان نەدەدا ئەم هاوڕێیە لەنزیك بوون لێیان و شێواندنی وێنەکەت لە بەردەمیاندا سەرکەوتووبێت ..**
**بۆ ئەو هەڤاڵانەی کە خۆیان هاڕێیان نیە، تکاتان لێدەکەم هاوڕێکانمان مەدزن!**

*   *   *

ڕۆژێك دەگەڕێینەوە*

کاتێك لە قوتابخانە بووم لە وانەی مێژوو کۆچی زۆرە ملێم دەخوێند بە درێژایی سەدە و لە وڵاتە جیاوزەکاندا، هەموو خەمم ئەوە بوو وانەکە لەبەر بکەم و سەرکەوتووبم لە وانەی مێژوو بۆ ئەوەی نمرەی تەواوی لێ بێنم، وە هەرگیز بیرم لە ووردەکاری هەستی ئەو کەسانە نەدەکردەوە کە لەو بارودۆخە ژیاون .. گەورە بووم .. و داگیرکەر هاتە ناو وڵاتەکەمەوە، بارودۆخی شەڕ ناچاریان کردین کۆچ بکەین، ئەی خوایە گیان چەند بە ئازارە لە ڕاستیدا! ..
نەمتوانی هەموو ئەو شتانەی کە خۆشم دەویست لەگەڵ خۆم بیانبەم .. تەنانەت شوناسی نیشتیمانیەکەم کە ڕۆحی من لە نیشتیمانەکەم دەسەلمێنێت بە ناچاری لە خانووە ڕۆخاوەکەمان بە جێم هێشت، زۆرێك لە ئازیزانی ڕۆحم لێ وون بوو، و هیچیش لە بارەیانەوە نازانم، بیری هەموو شتێکی وڵاتەم دەکەم ،
تەنیا ئەو کاتە هەستم بە ناخی ئەو کەسانە کرد کە لەگەڵ من کۆچیان کرد و ئەو کەسانەی کە لە کتێبی مێژووەکەمدا کۆچیان کردووە، برین لە تامەکەی تێناگات تا تاقی نەکاتە ..

* * *

**هیچ شتێك لەو ناچێت***

**بەدوای چارەسەرێکی کاریگەردا دەگەڕام بۆ خەم، بۆ ئارام کردنەوەی دڵم لە ساتە نیگەرانیەکاندا، وە هەرگیز شتێکم وەك نوێژ نەدۆزیەوە بو لابردنی ئازارێك لە دڵمدا ..**
**هیچ چارەسەرێک نیە وەك ئەوەی کە نوێژ لە ناخماندا بەجێی دەهێڵێت.**

* * *

**بە هێواشی نوێژەکانت بکە، پەراوێزی مەکەن و بە تەمبەڵیەوە مەیکەن وەك ئەوەی بارێکی قورس بێت بەسەرتاندا ، ئەوە ئاسوودەیی تۆیە ، ئەوە دڵنیاکەرەوەی تۆیە، ئێمە لە ڕۆژێکدا پێنج جار پەنا دەبەینە بەر خودا لە نوێژەکانماندا بەبێ ئەوی نوێژێکی زیادە بکەین، وە هەست بە نیگەرانیەکی زۆر دەکەین لە دڵمان و هست بە شکان دەکەین ..**
**لەبەر ئەوەی ئێمە نوێژەکانمان بە جوانی ناکەین، و ئەو کاتەش هەست بە نزیکی خۆمان لە خودا ناکەین ..**
**فەرموودەیەکم خوێندەوە کە پێغەمبەر(د.خ) لەنێوان سوجدەکانی دەیفەرموو:( اللهمَّ أغفِرْ لي وارْحَمْنِي وأجبُرْني واهْدِني وارْزُقْني) ، رواة الترميزي من حديث ابن عباس .. واتا: (خودایە لە گوناهەکانم خۆشبە، و ڕەحمم پێ بکە، و ناچارم بکە، و هیدایەتم بدە، و ڕزق و ڕۆزیم پێ ببەخشە) .**

**زۆر بیرم لە وشەی(وأجبُرْني) واتا: ناچارم بکە، دەکردەوە .. چەند پێویستمان بەوەیە هەست بەو یارمەتیەی خودا بکەین لەسەرمان!.. هیچ کەسێك نیە دڵت ناچار بکات جگە لە خودا، دڵت ئاسوودە نابێت بە هیچ شتك جگە لە خودا، هیچ دڵسۆز و میهرەبانێک نیە بۆ دڵت جگە لە خودا، هیچ کەسێك ڕێنیشاندەرمان نیە جگە لە خودا، بە وریایەوە نوێژ بکە. لەزەتی دونیا زۆرە و هەست بە نەمانی ناکەین .. پاداشتی گوێڕایەڵیەکانمان لەلایەن خوداوە بۆ دەنوسرێت وەکو ئەو نوێژانەی کە لە تەراویح و شەونوێژ دەمانکرد، ماندوویەتی جەستە لادەچێت بەڵام پاداشتەکەی دەمێنێتەوە ..**

* * *

**هەندێکجار نیگەرانیەکانمان دەبن بە بار بەسەرمانەوە، هەموو ئەو ئیشانەی کە لەسەرمان داواکراوە جێ بەجێی دەکەین، کاتێك دێین بۆ نوێژکردن بە پەلە نوێژەکە دەکەین وەك ئەوەی کەسێك پێشبڕکێمان لەگەڵ بکات، بەو شێوەیە جێ بەجێی ناکەین کە داوامان لێکراوە تا ڕوکنێك لە ڕوکنەکانی بەدەست بهێنین، ئەوە ئارامکەرەوەیە، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەی بیلال بانگ بدە، و دڵمانی پێی ئارام بکەرەوە ..**
**ئێمە بێ ئاگایین لە سەرچاوەی ئاسوودەییمان، سەرقاڵی گەڕانین لە سایتە کۆمەڵایەتیەکان و گرنگی بە قسەکردنی کەسانی دەوروبەرمان نادەین، وە کاتێك پرسیارێکیان لەسەر شتێك لێکردین، داوایان لێدەکەین قەسەکانیان بۆمان دووبارە بکەنەوە، وە کاتێك نوێژ دەکەین گوێمان بۆ قسەکانیان شل دەکەین و بەڵکو بیریش لە قسەکانیان دەکەینەوە ..**
**لە نوێژەکانمان ئاسوودەیی هەیە، لە سوجدەکانمان، وە لە نزیکیمان لە خودا، چەند خولەکێکی کەمە بەڵام ئارامی و هێز بۆ دڵمان بە دەستدەهێنین بە هۆگریمان بۆ خودا ..**

***   *   ***

**چی بەسەر دڵتدا هاتووە هاوڕێ! ..**
**ئایا تووشی تەنگەتاووی بووە! ..**
**دوو رکعات نوێژ بۆ خودا بکە، وەکاتێك فاتیحە دەخوێنیتەوە کەمێك دەنگت بەرزتر بکەرەوە بە ووتنی: [ الحمدُ للهِ ربَّ العالمينَ ، الرحمنِ الرحيمِ ] ، و پاشان ئایەتێك یان سوڕەتێکی نزیك لە دڵت کە حەزت لێیە بیخوێنیتەوە بخوێنە. خودا لەسەرەوە هەمیشە ئاگای لە دڵتە، دڵێك پەنای گرت بە خودا لە کاتی تەنگانەدا، خودا هەرگیز بە بێ هیوایی نایگەڕێنێتەوە وە حاشا لەوەی بە بێ ئومێدی بیگەڕێنێتەوە ..**

***   *   ***

**دڵ لە بڕوا بەخۆبووندا***

**خودا رزقی ئێمە بدات بە دانانی ئەو کەسانەی کە وامان لێدەکات متمانەمان بە خۆمان زیاد بێت، چەندین ساڵی خایەند تا متمانەمان دروستکرد، ئەوان وایانکرد ئێمە کەسانێکی سەرکەوتوو بین لە ژیانماندا بە پشتیوانی خودا، پاشان بە پشتیوانی ئەو هاندان و ئەو ڕەخنە بونیادنەرانەی ئەوان ..**
**گەیشتینە ئەو پلەو پایەی کە بەهیوا بووین پێی بگەین، وە هەندێك لە خەڵکیش هەیە متمانەمان لەناو دەبەن تەنها بە چەند خولەکێکی کەم ..**
**وەك پەندە ژاپۆنیەکە کە دەڵێت:**
**( ئەوەی بە دەستت دروستی دەکەیت ... دەستەکەی ترت لەناوی دەبات )**
**دەستبگرن بەو کەسانەی کە متمانە بەخۆ بوونتان زیاد دەکات، وە ئەمەش جۆرە هەڵبژاردنێکی قورسە بۆ بەدەستهێنانی لە نێوان هاوڕێکاندا ..**
**دووربکەوە لەو کەسانەی کە هەیشە وشەی نەرێنی دەرئەبڕن؛ تۆ لەوان بەنرختر و دەوڵەمەندتری؛ چونکە ئەوانە دەگەڕێنەوە لات کاتێك کە خۆیان دەڕۆن و هیچ شتێك بەدەست ناهێنن ..**
**هەندێك نامەی هاندان یان وشەی ئازیزانت لە دەفتەرێکی بچووك دابنێ لە گیرفانتدا و هەموو بەیانیەك بیخوێنەوە؛ بۆ ئەوەی هەمیشە ئامانجەکەت بە بیربێتەوە و بەردەوام بیت لەسەر ڕێگای سەرکەوتن ..**
**لە پەڕێکی بچووکدا بنووسە: من دەتوانم، دەگەم بە ئامانجەکەم بە پشتیوانی خودا، پەڕەکە هەڵبواسە لەو ژوورەی کە دەخوێنید تێیدا بۆ ئەوەی وورەت بەرزبکاتەوە کاتێك دەیخوێنیتەوە ..**
**تۆ بەڕاستی دەتوانیت ئامانجەکەت بەدەستبهێنیت و کارێکی ناوازە بکەیت! ..**
**پشت بە خودا ببەستە، کاتەکانت ڕێك بکە، و هۆکار بۆ کارەکانت دابنێ بۆ ئەوەی بە جدی هەوڵ بۆ ئامانجەکەت بدەی ..**

**وەکو یەکێك لەو کەسانەی کە کاتێك لە قۆناغی ئامادەیی بوو لەسەر درختەکە نووسی بووی ( .. دکتۆر ..)، وە گەورە بوو، وە بوو بە دکتۆر ..**

***    *    ***

**ئێمە مرۆڤین، و هەندێکجاریش هەڵە دەکەین.**
**لە ناخماندا حەزێکی قوڵ هەیە بۆ ئەزموونکردنی شتەکان، هیچ کەسێکیش سوود لە تاقیکردنەوەی کەسێکی تر نابینێ، مەگەر ئەوەی خودا ڕەحمی پێ کردبێ، لە ناخماندا مڕاقێك (فزوڵیەك) هەیە کە بگەڕێین و تامی شیرینی ئەزموونەکان بکەین، چا هەر ئەزموونێك بێت ..**
**هەندێکجار هەڵەی ئەوانی تر دیارییەکی خۆڕایە بۆ ئێمە؛ تا لە دوورەوە فێری هەستیان یان کاردانەوەیان بین بەرامبەر ئەو ئەزموونەی یان ئەو زەحمەتییەی کە پێیدا ڕۆیشتوون ..**
**وە کەم کەسمان لەوانی تر فێربووین، و کاتێك ئەکەویتە ناو هەڵەوە یان شکست ئەهێنێت لە ئەزموونکردنەکەی یەکسەر پەشیمان دەبێتەوە ..**
**کەواتە لە هەڵسووکەوتەکانت مەبە بازنەیەك کە لە هەموو بەربەستێکی دەوروبەری دەوەستێت، بەڵکو هەوڵبدە لە هەموو سوڕانەوەیەکدا سوود وەربگری دەربارەی ئەو هەڵانەی کە پێشتر تێتپەڕاندووە و شەرەزایی و ئەزموونت لێ وەرگرتووە، وە فێربە کە هەڵسووکەوتەکات نەپێویت لەسەر حسابی هەڵەی کەسانی تر ..**
**ژیربە و زۆر بیربکەوە پێش ئەوەی بچیتە ناو هەر ئەزموونێکەوە.**

* * *

هەندێك خەڵك وابیردەكەنەوە كە ناتوانن گۆڕانكاریەك یان بەرەو پێشچوونێك لە خۆیدا بكات، ژیانی خۆی لەسەر ئەو پەندە تێپەڕ دەكات كە دەڵێت: (( من شب على شيء شاب عليه )) واتا: ( هەر كەسێك لە گەنجێتیدا ڕا بێت لەسەر شتێك تا پیر بوونیش هەر لەگەڵی دەمێنێتەوە )، هەوڵ نادات كە هەندێك لە خۆ ڕەوشت و هەڵسوكەووتی بگۆڕێت، وە یان بەهرەكانی نویێ بكاتەوە جار جارە، تەنانەت ئێمەش هەندێكجار لە پێشینانەوە عادات و تقالیدمان بۆ دەمێنێتەوە، وە هۆكاری ئەم عادات و تەقالیدانە یان هۆكاری بڵاوبوونەوەی لە یاد دەكەین و گوێی پێ نادەین، بەڵكو دەبێت پابەند بین پێوەی، وە ڕەنگەیشە بنچینە و یاساكەی لەسەر هەڵە بونیاد نرابن،

با ئەم عادات و خووانە بكەینە كۆڵەكەی ژیان كە تێیدا بتوانین لەگەڵ زەریای دەوروبەرمان خۆمان بگونجێنین ..

بەو پەڕی توانای خۆت هەوڵبدە كە پەرە بە خۆت بدەیت و تواناكانت نوێ بكەیتەوە، و مەگری لەسەر شیری ڕژاوو، وە سەیری لایە بەتاڵەكەی پەرداخە ئاوەكە مەكە، خۆت ڕەفتار و هەڵسوكەوتت دروست بكە، و متمانە بە تواناكانت بكە، و جەستەیەكی لێ دروسبكە كە لەسەری بڕۆیت و ڕێگا هەڵە نەكەیت، ئارامت هەبێ و متمانەت بە خودا هەبێت، وە پێش هەموو شتێك نەكەیت واز لە مافێك لە مافەكانی خودا بێنیت بۆ هیچ كەسێك بەهۆی هەر عادات و تەقالیدێكەوە ..

*　　*　　*

**ئەو دڵانەی کە لە ئێمە ناچن***

**ئەو کەسەی دڵێکی باشی هەیە بەدەست مەعاناتەوە دەناڵێنێت ..**
**زۆر ئەم قسەیە بە گوێمان دەدرێتەوە، وەکو ئەوە وایە میهرەبانی دڵ بووبێتە لاوازی لە نێو مرۆڤایەتیدا! ..**
**خۆی ئەمە لاوازی نیە، بەڵام بەهۆی زۆری چەوسانەوەی ئەو کەسانەی کە دڵێکی باشیان هەیە وە نەبوونی دڵسۆزی لە کۆمەڵگاکانمان، مەگەر ئەوەی خودا ڕەحمی پێ بکات، هەندێك خاڵك وشەی (( دڵێکی باش ))ـیان شێواندوە!..**
**هەندێك کەس بنەمایەکیان لا دروست بووە:**
**ئەو باشە، کەواتە دەچەوسێتەوە (استغلال دەکرێت) .**

***  *  ***

**ڕەنگە هەندێك کەس بە جلی جوان و ڕازاوە، و براندێکی نەخشاو، خۆیان جوان و کامڵ بکەن، بەڵام سەرمان سوڕدەبێت کە لە پشت ئەو قوماشە گرانبەهانە کەسانێکی خاڵی خاڵی لە ڕەوشت و مرۆڤایەتی هەن، هەندێکیان بایەخ بە ڕازاندنەوەی جوانی دەرەکیان دەدەن بۆ خەڵکی، و جوانیە ڕاستەقینەکەیان لە بیرکردووە، ئەوەی پەروەردگاری جیهانیان سێری دەکات تەنها جوانی ناوەویە! ..**

***  *  ***

**گرنگی مەدە بەو کەسەی کە گرینگیت پێ نادات، وە هەڵمەستە بە بەخشینی هەستەکانت بەو کەسانەی کە شایەنیان نیە وە بێ بەشکردنیان لەو کەسانەی کە بە ڕاستی شایەنین ..**
**دڵت بپارێزە، لە تەمەنت نەدزی و بیدەی بە کەسانێك کە شایەنی هیچ شتێك لە قوربانیەکانت نین، تا ڕۆژێك نەیەت بە حەسرەتەوە بگری بۆ ڕابردوو ..**
**دڵە بچووکەکەت شایەنی پشوودانە ..**

***  *  ***

**زۆرجار پێویستیان بە ڕێکەووت و ڕووداوی زۆر هەیە بۆ ئەوەی بزانن ئێمە چەندمان خۆش دەوێن، ڕەنگە بەهۆی یەك مەوقیف لە ئێمەوە تووشی  شۆك بن، وە ڕەنگە لەگەڵمان بگۆڕێن، بەبێ ئەوەی دەرك بە بارروودۆخمان بکەن یان بپرسن بۆ چی ئەم بارودۆخەمان بەسەرهاتووە ..**

***　*　***

**کاتەکانت بەنرخە .. بگرە ئەوە بە نرخترین شتە کە لە ژیانتدا هەیە ..**
**دڵنیابە لەوەی کە لەگەڵ ئەو کەسانەی بە فیڕۆی نەدەیت کە دوو دڵن لە دانانت بە هاوڕێی خۆیان، یان بە نیوە رەغبەتێکەوە، یان بە نیوە بڕیارێك دەیانەوێیت، تەنانەت ئەو جورئەتەیان نیە کە لە بەردەم ئەوانی تردا باسی تۆ بکەن،**
**تەنها لەگەڵ ئەو کەسانە بن کە دەزانن شەرم ناکەن لەگەڵتان بن، ئەوان تا کۆتای ژیانیان ئارەزوویان هەیە لەگەڵیان بمێنیتەوە، دەستتان پێوە دەگرن، و بارودۆخ نایان گۆڕێت ..**

***　*　***

**شەمەندەفەری ساختە***

هیچ شەمەندەفەرێکی هاوسەرگیری نیە تا هەندێك لە كچان لەبیر بكات، بەڵكو قەدری خودا هەیە کە لەکاتی گونجاوی خۆیدا دێت، هەندێکجار خودا لە خراپەی هاوسەری خراپ بەدوورمان دەگرێت و دەمانپارێزێت، وە هەندێکجار لەو شتانە لامان دەدات کە شایەنی ئێمە نیە، خودا ژیانی ئێمەی نووسیوە،
هیچ شەمەندەفەرێک نیە جگە لە تەنها وەهمێك بۆ خەمخواردنی ئەو کچانەی کە خودا هێشتا قسمەتی هەڵنەستاندوون ..

* * *

بۆ هەموو کچێك ..
ئەڵقەی هاوسەرگیری لەدەست دەکەیت، و جوانترین جلی بوکێنی لەبەر دەکەیت بە پەشتیوانی خودا، بەڵام ئارام بگرە، هەموو شتێك دەتوانرێت بە گەڕان و هەوڵ و تێکۆشان بە دەست بهێنرێت .. تەنها هاوسەرگیری نەبێت، دڵنیابە خودا کەسێکت پێ دەبەخشێت کە پارێزگاری لە گەوهەری ناوەوەت و نەرم و نیانەکەت دەکات،
دڵت پیس مەکە بە پەیوەندیە خۆشەویستیە کاتیەکان، هەر کەسێك بیەوێت تۆ ببێت بە هاوسەری ئەوا ڕێگای حەڵاڵ پێدەزانێت ..
دڵتەنگ مەبە ئەگەر شەمەندەفەری هاوسەرگیری بە لاتا تێپەڕی و لەگەڵ خۆیدا نەیبردی، ڕەنگە خودا خراپەی هاوسەرێکی نەگونجاوت لێ دووربخاتەوە، یان قەرەبویەکی زۆر باشتان بۆ بکاتەوە لە دونیا و دواڕۆژدا ..

* * *

**داپیرەم دوعام بۆ دەکات وە دەڵێت: خودا مێردێکی باشت پێ ببەخشێ کە پارێزگاریت لێ بکات**
**پێدەکەنم و دەڵێم: داپیرە ئەوەی دەمانپارێزێت خودایە نەك پیاو! ..**
**وە لەبەر خۆمەوە دەڵێم: من چیمە تا بمپارێزێت؟! ..**
**بە سروشتی خۆی دەمبەخشێت ئەو لە وێنەی جیاکاری نازانێت و دەڵێت:**
**دژایەتی مەکە کچەکەم، هاوسەر دادەپۆشێت خانوو دادەپۆشێت ژنیش دادەپۆشێت**
**ئەوەی دەمێنێتەوە ئەوەیە کە خودا داپپۆشیووە و هیچ ئاشکراکەرێکی نیە،**
**ئەوەی خۆی ئاشکرا کرد و خۆی نەپارێزت هیچ داپۆشەرێکی نیە،**
**خودا داپۆشەری هەمووانە، و هەمووان دەپارێزێت لە دونیا و دوارۆژدا ..**

* * *

## هاوڕێی خۆت بە*

کێ لە ئێمە چەند جار نەکەوتۆتە سەر زەوی، بەردەوام پێویستە ئێمە سەیری خۆڵ بکەین کە لە توانایدا نیە هیچ کارێك بکات ..
هەوڵدەدات هەستێ بەڵام دەکەوێتە خوارەوە، ئەو بەدوای کەسێک دەگەڕێت کە یارمەتی بدات بۆ ئەوەی جارێکی تر هەستێتەوە، دەستی پێوە دەگرێت بە توندیەوە دەستی دەگوشێت تا هیوای ژیانی بۆ بگەڕێنێتەوە، و ئەو زەردەخەنانەی بۆ بگەڕێنێتەوە کە لە نێو کەلێنی کۆڵانێک یان لاپەڕەیەك لە لاپەڕەکانی یادەوەریەکان لێی وون بووە، چاوەڕێی ئەو کەسە دەکات کە ڕەنگە بێت، وە ڕەنگیشە نەیەت ...
وەکو ئامۆژگاریەك، چاوەڕێی کەس مەکە کە لە هەستە تاڵەکانت دەرتبێنێت ..
ژیان هەر چۆنێك بێت جوانە چونکە ئەوە دیارییە لەلایەن خوداوە، و لە نێوان شیرینی و تاڵی دەسوڕێتەوە .. ڕەنگە بەشە تاڵیەکەی زیاتر بێت لە ژیانت، بەڵام ئەگەر ئەم تامە تاڵە نەبایە، ئەوا تامی ژیان نەدەما،
دەتوانیت بیکەی بە کتێبێك کە چەندین زانیاری و سەرکێشی سەرنجڕاکێشی تێدابێت کە وا لە خوێنەر بکات کە دووبارە هەستێتەوە سەر پێ لە هەر ڕووداوێك لە ڕووداوەکانی ژیانیدا،
هەروەها دەتوانیت بیکەی بە کتێبێك کە بەرگەکەی باس لە هێزی دەرەوەیی بکات لە دڵخۆشی و دڵتەنگی یان هەر شتێك لەو بارەیەوە، لەبیرت بێت کە تۆ تاکە کەسی کە لە ڕاستی و کاتی خۆت بژیت کەسی تر نیە جگە لە خۆت ..
وە کەس بەرپرس نیە لە دڵخۆشکردنت جگە لە خۆت، خۆت ژیانت دروستدەکەیت، بۆیە بە باشی دروستی بکە، وە کارێك بکە کە بۆ خودا بێت ..

* * *

**هاوڕێی خۆت بە ..**
**کەس هەست بەوە ناکات چەند دەردەسەریت چەشتووە ..**
**کەس هەست بەوە ناکات  دڵت چەند تووشی تەنگی بووە ..**
**کەس هەست بە مەودای ئازارەکانت ناکات لە کاتی نەخۆشکەوتنت ..**
**کەس هەست بەوە ناکات کە چەند رۆحت لەدەستداوە و ئازارت**
**چەشتووە لە دووریان ..**
**کەس بە تەنگی ژیانت نازانێت ..**
**کەس هەست بەوە ناکات کە چەند فرمێسکت ڕەشتووە**
**بۆ لەدەستدان و ئازار و دڵتەنگی ..**
**ئەو کەسەی کە هەمیشە لەگەڵتدایە دڵی خۆت و دایك و باوکتە ..**
**با خودا هەمیشە لە دڵت بێت، هەر کەسێك نزیك بێت لە خودا ئەوا هەست بە ئاسوودەیی دەکات، ڕازی بوون لە ژیان دەوری دەدات، وەزەردەخەنە دەکات و باوەڕ بە خودا دەکات کە ئازارەکە هەر چەندە گەورە بێت یان بچووك ئەوا پاداشتی لەسەرە، مادام دڵی خۆی سپاردوە بە پەروەرێنەکەی ..**

***   *   ***

**یاسا ئامادەنەبووەکان***

**شتانێکی خراپ هەیە ئەنجامی دەدەین بەرامبەر بە خەڵکی، وە هیچ سزادانێکی لەسەر نیە لەو یاسایەی کە حوکمی ئێمەی بە دەستەوەیە، بەڵام بڕوام بەوەیە لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگار سزا دەدرێینەوا لە سەری، بەوەی کە ڕۆژێک لە ڕۆژان مافەکان بۆ خاوەنەکانیان دەگەڕێتەوە .. لەسەر ئەو بنەمایەی (( دونیا دەسوڕێتەوە )) و (( هەر چەند ئیدانە بکەیت ئیدانە دەکرێیتەوە ))، لەوانەیە نەشزانن چیمان بەسەر دێت، بەوەی کە مافەکانیان لەلایەن خوداوە لێمان سەندراوەتەوە ، تەنها خودا دەزانێت !.**

* * *

زەردەخەنەی دڵ*

ڕەنگە بتوانین ئەو وشانەی کە لە کەسە خۆشەویستەکانمان دەمانبیست لەبیری بکەین، و ئەوانەی کاریگەریان لەسەرمان دروستکرد، بەڵام لەم قسانە تەنها خەندەیەك دەمێنێتەوە کە شوێنەوارو یادەوەری خۆی لە یادماندا جێ دەهێڵێت، وامان لێدەکات خەندەیەك بکەین و بڵێین : (( ئەوان چەند جوانن )) ..

* * *

ئارام گرتن و بەر گرتن*

ئارامگرتن میوەیەکە کە لە ناویدا گەوهەرێکی هەڵگرتووە بۆ ئەوانەی کە تەنها چاوەڕێی بەرەکەی دەکەن، وە کەس ئەم بەربوومە بەدەستی ناهێنێ مەگەر ئەو کەسەی کە لە کۆتایەکەیدا دەیچنێتەوە، ئەو کەسەی دێت و چاوەڕێی حەسانەوە دەکات لە یەزدانی بەخشندە و نەرم و نیاز لە بەرزایی ئاسمانەکان بە دوعاکانی، پەروەردگار هیچ کاتێك ئیهمالی ناکات، ئەتوانێت بە چاو تروکانێك هیواکەی بۆ بهێنێتە دی، وەك چۆن لە کتێبە پیرۆزەکەیدا فەرموویەتی:
[[ وَ بَشِّرِ الصَّابِرِينَ ]]، ( البقرة: ١٥٥ ).
سەیری حەسانەوەکەی خۆت بکە، وە بە ئارامیەوە بژی ئەو کات بەروبومە شیرینەکەی ژیان و ژیانێکی خۆش دەدۆزیتەوە ..

* * *

لەسەر مامۆستایە کە یەکەم جار خۆی فێر بکات ئەوەی بە قوتابییەکانی دەڵێت لەسەر خۆی جێ بەجێی بکات، وە تێبکۆشێت بۆ ئەنجامدنی ئەم کارە، چی سوودێکی هەیە گەر مێشکی قوتابییەکانی پڕ بکات و مێشکی خۆی و جەستەی خاڵی بن لە جێ بەجێکردنی!.
ئایا پێشکەشکردنی وانەیەك لە ئەدەبیات و فێرکردن لەبارەی بەهاکانی ئیسلام و ڕەتکردنەوەی زوڵم چی سوودێکی هەیە، گەر خۆیَ ستەمکار بێت و مافی کەسانی تر بخوات و خۆبەزلزان بێت!.
پێغەمبەر د.خ دەفەرموویّت : (( لاَ تَزُولُ قَدَمَا عَبْدِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ عُمْرِهِ فِيماَ أَفْنَاهُ، وَعَنْ عِلْمِهِ فيْمَ فَعَلَ فيه، وَعَنْ مَالهِ مِنْ أَيْنَ اكْتِّسَبَهُ وَ فِيمَا أنْفَقَهُ وَعَنْ جِسْمِهِ فِيمَا أبْلاَهُ )). رواة الترميذي ..، واتا: (هەر دوو پێی هیچ عەبدێك هەنگاو نانێت بەرەو بە هەشت تا پرسیاری لێ نەکرێت سەبارەت بە تەمەنی کە لە چیدا بەسەری بردووە، وە سەبارەت بە زانستەکەی ئایا کاردەوەی پێ کردووە، وە سەبارەت بە پارە و ماڵەکەی چۆن پەیدای کردووە و لە چیدا خەرجی کردووە، وە سەبارەت بە لاشەی لە چیدا بەکاری هێناوە و دایهێناوە) .
وە خودای باڵادەست لێپرسینەوەت لەگەڵ دەکات ئەگەر دڵسۆز نەبیت لە کارەکانت ..
چەند ڕێزم لە مامۆستاکان دەگرت بە قسەکانیان لام وابوو ئەوان پێشەوای منن، بەڵام لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگار سێرم کردن کە خۆیان هیچ شتێك جێ بەجێ ناکەن نە لە ترسی خودا نە لە ترسیان بۆ قوتابییەکانیان،
مەگەر ئەوەی خودا ڕەحمی پێ کردبێت!.

* * *

**چاوەڕوانیەکی درێژ***

**هیچ شتێک ئەوەندە دڵ ئازار نادات کە دووربیت لە خۆشەویستانت، هەڵسوکەووتی دڵسۆزانەمان دەرخست بەرامبەر ئەو کەسانەی کە خۆشماندەوێن، فرمێسک دەڕێژین لە دوعاکانمان بۆیان و بیری نزیك بوون لەوان دەکەین ..**
**هیچ ئازارێك وەك ئەو ئازارە نیە کە مرۆڤ دەیچێژێت کاتێك یەکێک لە خۆشەویستانی نەخۆش بێت و ئەویش لێی دووربێت، ئەو بە تەنها ئازار دەچێژێت، ئێمە هیچ شتێکمان لەدەست نایەت بیکەین جگە لە بێدەنگی و دوعاکردن بۆیان لەلایەن خوداوە! ..**

*** * ***

**هەندێکجار هەست بە شتێك دەکەین کە هەندێکەس پێی دەڵێت: کەوتن، بەڵام ئەوەی کە دەیزانم ئەوەیە کە ئەم قۆناغە هێز دەنوێنێت، لامان گرینگ نیە کە کەسێك بێتە ژیانمانەوە یان بچێتە دەرەوە، یان کێ گۆڕا یان کێ وەك خۆی مایەوە، یان کێ بە هەڵە لێت تێگەیشتووە و دەتەوێت بۆی ڕوونبکەیتەوە و پاساو بۆ ئەو ڕەفتارانە بەهێنیتەوە کە لە تۆوە دەرچوون! ..**
**چاوەڕێی کەس ناکەین،و دەست بە کەسەوە ناگرین، سەیری هەموو شتێك دەکەین بە بێدەنگی و بە بیرکردنەوەیەکی قوڵ .. وە فێری شتانێك دەبین کە پێشتر گوێمان پێ نەدەدا ..**

*** * ***

**ماوەی دوربوونت درێژەی کێشا، بەهۆی چیەوەیە؟ وە کەی دەگەڕێیتەوە؟ بیری بوونت و قسەکانتمان کردووە لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان ..**
**خۆم وون کرد بۆ ئەوەی ئەوان بیری بوونی من بکەن لە نێوانیان ..**
**ئەی بیری تۆیان کرد؟**
**نەخێر، بەڵکو لەبیریان کردم و پرسیاریشیان لەسەر نەکردم ..**
**ئازیزەکەم .. لە دونیای تۆڕە کۆمەڵایتیەکاندا کەس کەس لەدەست نادات ..**
**جگە لە هەندێك کەس نەبێ!.**

## غیرەی دڵ*

غیره دەكەم ..
وە غیره كردنەكەی من وەكو غیرەی هیچ كچێكی تر نیه ..
من غیره ناكەم لەو خانمانەی كه جلەكانیان لە گرانبەهاترین ماركەكانی دونیان، یان ئەو خانمانەی كە ئارایشت و بۆنی گرانبەها دەكڕن، وە یان ئەو كەسانەی كه جلێكی جوانتر لە جلەكانی من لەبەر دەكەن یان لەو كەسەی شێوەی لە من جوانتره ..
بەڵكو غیره لەو خانمه دەكەم كه پێش من دەكەوێتەوە
لە نزیك بوونەوە لە خودا!
لەوەی كە من باش نەبم لە لەبەركردنی كتێبی خودا ( قورئانی پیرۆز )، وە هەندێك خانم پێش من دەگرنەوە لە لەبەركردنی بە قسە و بە ڕەفتار ..
ئەوەی كه كەمتەرخەم بم لە لە نوێژەكانم و لە كاتی خۆیاندا نەیانكەم، وە هەندێك خانمیش هەن نوێژەكانیان لە كاتی خۆیدا دەكەن و پارێزگاری لە نوێژە سونەتەكانیشیان دەكەن ..
وە لەوەی كەمتەرخەم بم لە كردنی سونەتەكان، وە هەندێك خانمیش هەن پێشم دەگرنەوە لە جێ بەجێ كردنی سونەتەكان ..
بڵێ: ماشاء الله ، خودا چاكی بكات ..
وە بە خۆم دەڵێم: چیت كردووە تا خودا خۆشی بوێیت! ..
هەموو ڕۆژێك لەگەڵ دڵم دەدوێم: تۆ لە زۆر شتت كەمە لە پەرستشكردن بۆ ئەوی بەهێز بیت لە پەرەستنی خودا، ئەو پەرستشانەی خۆت دروستی دەكەیت تەنها سوودی بۆ خۆت دەبێت، لە لەبەركردنی قورئان و كاركردن پێوەی كەمتەرخەمی، كەمتەرخەمی لە جێ بەجێكردنی ئەو سونەتانەی كه ڕۆژانه فێری دەبیت .. ئەی دڵم: جگە لە خودا هیچ كەسێكی ترت نیه، خوایە یارمەتیم بدات لە یادكردنەوەی تۆ و سوپاس كردنی تۆ و پەرستشێكی باش ..

*   *   *

**ئەو زەوقم سەرزنشت دەکات و من بە دۆڕاو دەزانێت، وە دوای چەند ڕۆژێك دەیبینم هەوڵدەدات لاسایی من بکاتەوە و دواتر شکست دەهێنێن! ..**
**ئەو کەسانە چەند زۆرن کە هەوڵدەدەن لە ئێمە کەم بکەنەوە، بەڵام پێویستە لەسەرمان کە هەر بەو شێوەیە بین کە پێشتر بووین، نەگۆڕێین و زەوقی خۆمان بۆ کەس نەگۆڕین، هەموو کەسێك لە جلوبەرگەکەی و هەڵسوکەووتەکەی و تەنانەت لە قسەکانیشیاندا زەوقی خۆیان هەیە!.**

* * *

وەفا لە ئامادەنەبوونیدا *

دڵی پڕ لە سۆز فێری کردم کە زمانم بپارێزم لە باسکردنی ئەو کەسەی کە خۆی لەوێ ئامادە نیە بەشێوەیەکی زۆر ئاسان، ئەویش بەوەی کە بیهێنمە پێش چاوی خۆم ئەو کەسەی باسی دەکەم لە نێوان ئەو کەسانە دانشتبێت کە باسی دەکەم..
با لە گفتوکانماندا خودامان لە بیربێت، با لەگەڵ یەك گفتوگۆبکەین، هەستینە سەرپێ و بەهێزبین لەجیاتی ئەوەی باسی یەکتری بکەین ..

* * *

لە کۆبوونەوەی زەممکردندا، هەمووان بەشدار دەبن لە گفتوگۆکەدا، هیچ کەسێکیان تێدا نیە کە حەرام بوونی ئەو کارەیان بە بیر بێنێتەوە، کە وەکو خواردنی گۆشتی ئەوانی تر وایە ، کەسێک لە کۆبوونەوەکە دەچێتە دەرەوە و بۆ ئەو کەسەی کە زەممیان کردوە باس دەکات و پێی دەڵێت کە زەممیان کردویت و هەموو کەسێك باسی تۆی کردووە، بە جۆرێك کە ویژدانی خۆی سەرزنشت کردوە دەیەوێت ئەو کەسە لێی ببورێت، و دووبەرەکی و فیتنە دروستدەکات لە نێو هەمووان ..
دەبوو هەر یەکەمجار بێدەنگی بکردنایە لە زەممکردن، وە خودای بە بیر بەهێنایەتنەوە، و وایان لێ بکات کە بە باشە باسی ئەو کەسە بکەن کە زەممیان دەکرد ..
نەك لەگەڵیان گۆشتی ئەو کەسە بخوات، وە دواتریش دوای لێخۆشبوونی لێ بکات!.

* * *

**دەستەواژەیەك كە لەسەر بەرهەمێكی بازرگانی نوسرابوو سەرنجی ڕاكێشام!.**
**(( ئەگەر ڕازیمان كردیت باسمان بكە، وە ئەگەر ڕازیمان نەكردیت قسەمان لەگەڵ بكە )) ..**
**زۆر كەسم بیركەوتەوە كە بە ڕوومدا زەردەخەنەیان دەكرد و كەچی لە پشتەوە باسیان دەكردم ..**
**زۆر باشە، دەبێت لەوان زۆر باشتر بم، پێویستە سوپاسیان بكەم لەبەر ئەوەی چاكەكانی خۆیانیان پێ بەخشیووم ..**
**چەند جوان دەبێت گەر پێیان بگوتمایە كە ئاگام لە هەڵەكانم بێت تا ڕاستیان بكەمەوە و گرینگی بە خۆم بدەم، ئێمە فریشتە نین و كامڵیش نین، بەڵكو ئێمەش مرۆڤین و هەڵە دەكەین!. هەمووان پێویستمان بە كەسێكە كە ڕاستگۆ بێت لەگەڵمان لە خۆشویستندا بۆ ئەوەی ڕێنمایمان بكات بۆ هەموو هەڵەیەك كە لە ئێمەوە سەرچاوە دەگرێت! ..**

* * *

**هەموو مرۆڤێك گوڵێك لە باخی ژیانیدا هەیە كە هەر یەكێك لە گەڵاكانی كارەكتەرێكی جوان هەڵدەگرێت، بێ گوێ دانە ئەو گوڵانەی كە دڕكی ژیانبەخشیان پێوەیە، گوڵی جوان هەرگیز ناوەرێت و لە بۆنخۆشیەكەی كەم نابێت، وە بێ گوێدانە شێوەكەی، زۆربەمان بە وێنە دەرەكیە ساختەیەكانیان حوكم بەسەر ئەوانی تردا دەدەین، وە ناوەڕۆكی ناخیان لە یاد دەكەین .. ئەو كەسەی گوڵ هەڵدەگرێت وەكو ڕەنگەكانی دووبارە هەناسەكانی نوێ دەكاتەوە و دڵەكان نەرم دەكات ..**
**با هەمووان یەكتر قەبوڵ بكەین و بە ئارامی بژین! ..**
**بەو بۆنەیەوە، ئێوەش كامڵ نین!.**

* * *

## ئاوێنە و ئاواتێك*

ئەوەی بە دوای خۆت جێی دەهێڵیت تەنها ئاوێنەکەتە، خەڵکی ئەوەی پێ بیردیتەوە کە دروستت کردووە ..
ئاوێنەکەت شوێن پێی تۆیە .. وە بۆ هەر یەکێکمان ئاوێنەیەك هەیە ..
ئاوێنەکەت بنەخشێنە بە هەر جۆرێك کە  خۆت دەتەوێت ..

* * *

خەونی زۆر دەبینن، و کەمیش کار دەکەن، وە پێم دەڵێن: ئێمە وەك خەڵکی شانسمان لە ژیاندا نیە! ..
بۆ ئەوەی زەوی بونیاد بنەێن، دەبێت خەون ببینینن و ئامانجیان بۆ دیاری بکەین و هەوڵی بەدیهێنانیان بدەین، بە پشت بەستن بە ئافرێنەرەکەمان (خالقنا) و هۆکار هێنانەوە بۆ کارەکانمان، نەك تەنها هیوا بخوازین و کەمێك کار بکەین و دواتر بوەستێین و سەرزنشتی شانسمان بکەین!.
ژیان پێویستی بە کارکردنی بەردەوام هەیە، ڕۆژێك لە ڕۆژان دەڵێن:
فڵان لێرە بوو، و ئەمەش شوێن پێکەیەتی ..
وە لەبەر ئەوەی ژیانی ڕاستیمان هێشتا دەستی پێ نەکردووە،
هەمیشە لە خۆم ئەپرسم:
ئایا دوای مردنم پاداشتی بەردەوامم بۆ دەمێنیتەوە؟
ئێمە لە دونیایەکی کاتیداین و هەموو شتێکی ناوی دەبێت لەناو بچێت، وە ژیان کردنی هەتاهەتایی لە دواڕۆژدا، ئەترسم بڕۆم و بێ ئەوەی هیچ چاکەیەك لە دوای خۆم بە جێ بەهێڵم کە بە هۆیەوە خەڵکی منیان بە بیر بێتەوە و دوعام بۆ بکەن!.

**وە لەبەر ئەوەی هەمیشە تەلەفۆنەکانمان بەکار دێنین دەتوانین پاداشتی زۆر کۆبکەینەوە، بۆیە شتانێك دابنێ لە تۆڕە کۆمەڵایەتیان کە دوای مردنیشت سوودی هەبێت بۆت، لەوانەیە بتوانیت ژیانی کەسێك بگۆڕیت بۆ باشتر بەهۆی وێنەیەکەوە یان وشەیەکەوە کە تۆ بڵاوتکردۆتەوە، گرنگ ئەوەیە کە ڕەنگە پاداشتێکی زۆرت وەرگرتبێت، وە خۆشت پێی نەزانی، بۆیە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان بکە بە ڕووبارێکی بەردەوام کە پاداشتی زیاتر کۆبکەیتەوە، نەك ببێتە تاوانێکی بەردەوام بۆت وەك بڵاوکردنەوەی گۆرانی و مۆسیقا و وێنەی نەشیاو.**

*　*　*

**تەنها ئاوات خوستن، هیچ شتێك لە ژیانت ناگۆڕێت ..**
**هاوڕێکەم ..**
**هەوڵدان بۆ بەیهێنانی ئاوەتەکەت، ئەوە هەموو شتێك دەگۆڕێت ..**
**سوودی چی دەبێت گەر هیواکانت بنوسیت و قسەیان لە بارەیەوە بکەیت وە هیچ کارێك نەکەی بۆ بەدیهێنانی! ..**
**هیچ شتێك! ..**
**هیچ کەسێك کلیلی سەحراوی پێ نیە تا خۆزگەکانت بۆ بەدی بەهێنێت، وە هەموو شتێکت لەسەر قاپێکی زێڕ پێ نابەخشرێت مەگەر خۆت هەوڵ نەدەیت، ئەوەی تۆ دەتەوێت بەدی دێت گەر تۆ بتەوێت، تەنها بەهێزبە بە خودا، و پشت بە ئەو وە پشت بە هۆکارهێنانەوەت ببەستە ..**
**بێ ئومێد مەبە، نا ئومێدی مەرگە لە ژیاندا ..**

*　*　*

**ئەو بیرکردنەوە دەمترسێنێت ئەم (دونیایەی تێیدا دەژین کاتیە)، چەند ساڵ تەمەنمان بێت، رۆژێك هەر دەڕۆین، تەنها کار و کردەوەکانمان لیَ دەمینێتەوە ..**
**چیمان پێشکەشکرد لە کردەوەکانمان!**
**ئایا بە دڵسۆزیەوە پێشکەشمان کرد؟**
**ژیانی دوارۆژ هەتاهەتایە، یان بە بەهەشت بڕواداران شاد دەبن بۆ هەمیشەیەکی بێ بن، کە نە ئازار نە نەخۆشی نە لەدەستدان نە ترسی تێدایە ..**
**یان دۆزەخ، کە ئازاری بەردەوامی تێدایە، و هیچ پشوودانێکی تێدا نیە، پێستەکان هەموو جارێك دەگۆڕێن بۆ ئەوەی ئازاردەر هەست بە ئازار بکات ..**
**خۆت هەڵی بژێرە کە ئەتوێت لە کام ماڵ بیت ..**

* * *

**خەڵک هەیە کارەکتەرێکی سەیری هەیە، کاری سەیر دەکەن بۆ ئەوەی سەرنجی خەڵکی دەوروبەریان ڕابکێشن، سەرنجی خۆیان دەدەن، و بە شان و باڵی خۆیان هەڵدەدەن، و وا بیر دەکەنەوە کە لەوانەیە سەرکەون، بەڵام: کەس سەرنجیان نادات، تەنها چەندێکی وەك خۆیان نەبێت ..**
**با سەرنجی خەڵکی ڕابکێشین بە بەجێ هێشتنی شوێنەوار و شوێن پێی جوان بۆیان بە کردەوەی ڕاستگۆیانە نەك دروست کراو!..**
**وە نەك بە دروستکردن!..**
**ڕۆژێك لە ڕۆژان خەڵك بەبێ ئەوەی پێداگری لەسەر بکەین سەرنجمان دەدەن، بە هۆی کارە باشەکانمان ، تەنانەت ئەگەر ئێمەش ڕۆیشتووبین ..**

* * *

هاوڕێیەك پێم دەڵێت: كاتێك لە قۆناغی ناوەندی بووم، لە كاتی پشووەكاندا وانەی ئاینیم لە مزگەوتی قوتابخانە دەوتەوە، ژمارەی ئامادە بووان زۆر بوون سوپاس بۆ خودا، هەر چەندە تەمەنیشم كەم بوو، هەوڵم دەدا تا ئەو پەڕی توانای خۆم وڵامی پرسیارە ئاینیەكان بدەمەوە و بەدواداچوونم دەكرد تا وڵامی كچەكان بدەمەوە، وە پێش ئەوەی قۆناغی ناوەندی تەواو بكەم یەكێك لەو كچانە پرسیاری لێ كردم لەسەر ئەو سایتە ئاینیانەی كە زانیاری لێ ڕادەكێشم، وە لە هەموو وانەكان ئامادە دەبوو پێم راگەیاند كە هەموو زانیاریەكان لە سایتی (صید الفوائد) وە (التحليل للإعجاز العلمي) وەردەگرم ..
دوتر چوومە قۆناغی ئامادەیی، وە پێداگر بووم لە سەر وتنەوەی وانەی ئاینی لە مزگەوتی قوتابخانەكان، ئەو كچەم لە دەستدا كە هەمیشە لە وانەكانم ئامادە دەبوو وە گوێی دەگرت، ڕۆژگار تێپەڕی و ئامادەییشم تەواو كرد و چوومە زانكۆ، وە دوای ساڵێك دەنگێكم بیست لە پشتەوە كە بە ناوی خۆم بانگی دەكردم، ئاوڕم دایەوە سەیرم كرد هەمان ئەو كچەیە، زۆر دڵخۆش بووم بە بینینی، یەكسەر پێی ووتم كە سوودی زۆری بینیوە لەو سایتەنە لە ژیانییدا، وە بڵاوی كردبووەوە لە هەموو شوێنێك و بۆ هەموو هاوڕێیانی و كەسانی دەوروبەری ناردبوو ..
سەرم پێی دەسوڕما، شتێكی سادە كە من ووتم لەو كاتەدا كە سەرقاڵ بووم، لەگەڵ ئەوەشدا و ئەو كاریگەریە مایەوە بەبێ ئەوەی دەرك بەم كاریگەریە گەورەیە بكەم! ..
چەند پاداشتی چاكەم بۆ دەنوسرێت بەهۆی بڵاوكردنەوەی ئەو سایتە بە سوودە! ئەی چی دەبوو ئەگەر گۆرانیەكم پێ بدایە و بڵاوی بكردایەتەوە!، دەبوو چەند خراپە و تاوان لە كتێبی كردەوەكانم بنوسرایە! ..
بەخیل مەبن لە بڵاوكردنەوەی چاكە هەر چەند بچووكیش بێت، ژیانی زۆرێك دەگۆڕێت تەنها بە هۆی ئەو چاكە بە فەزڵی خودا ..
ئێمە لێرەین بۆ ئەوەی كاریگەری دابنەێین، بۆیە كاریگەریتان باش بكەن ..

* * *

**کۆمەڵە هەستێك گەر هەستیان پێ بکەین***

زۆر شت هەیە ئەیزانین و هەستی پێ ناکەین ..
ئەم ئایەتە دەخوێنینەوە : [[ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَ يُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِين ]]، (البقرة:٢٢٢ )، بەڵام هەست بەوە ناکەین کە خودا چەند ئێمەی خۆشدەوێ کاتێك ئێمە خۆمان لە پیسیەك پاك دەکەینەوە، نەك تەنیا لەبەر ئەوەی زەڕەیەك لە پیسی جەستەمان لابەرین لە پێناو پاك و خاوێنی، بەڵکو ئەم کارە دەکەین بۆ بەدەستهێنانی خۆشەویستی خودا و نزیك بوونەوە لێی ..
دەزانین کە ( سبحانَ اللهِ و بحمدِهِ سبحانَ اللهِ العظيم )، تەرازووی کردەوەکانمان قورس دەکات، و دەیڵێین بێ ئەوەی هەست بەو واتا گەورەیەی بکەین ..
دەزانین کە فریشتەکان ئامادەن و کردەوەکانمان تۆمار دەکەن، وە لەگەڵ ئەوەشدا خراپە دەکەین و زەممی خەڵکی دەکەین ..
دەزانین کە کەسێك گەر بە قەدەر زەڕەیەك خۆبەگەورەزانی لە دڵیدا بێت ناچێتە بەهەشتەوە ..
وە لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك کەس دەبینین خۆیان بە گەورە دەزانن لەسەر شتانێك کە ڕەنگە هەر بێ بەهاش بن ..
ئەم ووتەیە دەزانین: ( ئەوەی ڕێگای زانیاری بەرەو خودا گرتەبەر، خودا ڕێگای چوونە بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات )، بەڵام هەست بەو واتایە ناکەین، و دەوەستین لە فێربوونی زانیاری وە زوو لە خەو هەستان بۆ کارەکەمان ..
زۆر شت دەزانین و هەست بە پاداشتەکەی ناکەین، وە کاتێك هەستی پێ دەکەین ئاسوودەیی و بەختەوەری ڕوو لە دڵمان دەکات، و ڕازی دەبین بە قەدەری خودا و دڵــخۆش دەبین ..

* * *

**لەگەڵ هاوڕییەکەم بووم، ئافرەتێکمان بینی کە قژی زۆر کورت بوو وە بە زەردەخەنەوە لەگەڵ هاوڕێکانی قسەی دەکرد ..**
**هاوڕێکەم پێی ووتم: خۆی چوواندوە بە پیاو، تۆ نازانیت ئەو ئافرەتە نەفرەتی لێ کراوە بەو خۆلێچوواندنەی بە پیاوان!.**
**وە دوای چەند ڕۆژێك بۆمان دەرکەوت کە ئەو کچە توشبووی شێرپەنجە بووە، و قژی تازە گەشەی کردبووەوە دوای وازهێنانی لە وەرگرتنی ژەمە کیمیایەکان .**
**پەلە دەکەین لە وێنەکێشانی ئەو کەسەی لە خەیاڵماندایە و بڕیاردان لەسەر کردەوەکانیان بەبێ دڵنیابوون و بەبێ هۆکار، وە لەوانەیە بارودۆخی تایبەتی خۆیان هەبێت کە بۆیان زەحمەت بێت لەبەردەم هەموو کەسێکدا بیڵێن ..**
**بە خێرای بڕیار لەسەر دەوروبەرەکەت مەدە، هەوڵ بدە بەم شێوەیە بەردەوام بیت، دواتر ئەوان ژیانی خۆیانیان هەیە و تۆش ژیانی خۆتت هەیە،**
**دوعای چاك بوون بۆ ڕۆحت بکە بەوەی خودا زمانت بپارێزیت لە بڕیاردان لەسەر خەڵکی بەبێ ئەوەی بزانیت چی ڕوودەدات لە دەوروبەریان..**

* * *

**هەور و باران***

**خودا بە سەرکەوتن و پێشکەوتن یارمەتیت دەدات لە هەوڵ و تێکۆشانەکانت بۆ شتێک گەر گومانی باش بەری بە پەروەردگارت، وە هۆکار هێنانەوە بۆ ئامانجەکانت ..**

***  *  ***

**با دەفتەرێکی بچووکت هەبێت کە هەموو بیرۆکەکانتی تیا بنوسیت،**
**تا لە بیریان نەکەیت، وە کێشە نابێت گەر بیرۆکەکانت بە کەسێکی باوەڕ پێکراو بڵێیت بۆ ئەوەی پشتگیرت بکات و هانت بدات تا بیرۆکەکانت پەرە پێ بدەیت،**
**پلان داڕێژ بە لە جێ بەجێکردنیدا و گوێ مەگرە بۆ کەسە دڵساردەکانی دەوروبەرت تا پێت بڵێن: تۆ ناتوانیت، بیرۆکەکەت شکست دێنێت! ..**
**زۆربەی داهێنراوەکانی ئەم سەردەمەمان چەند زەمەنێك لەمەوبەر پێیان دەگووت مەحاڵە یان بێ بەهایە و هیچ سوودێکی نیە!.**
**وە کاتێك هەموو باشترین کارەکان بۆ پێشخستنی خۆتان ئەنجام دەدەن پشیمان نابنەوە وە بە پێچەوانەی، کاتێك تەمبەڵ دەبیت و هیچ دەستکەوتێك لە بەهاری تەمەنت بە دەست ناخەیت،**
**وە کاتێك بە بیرۆکەیەکی زانستیانە دێیت و لە بووندا دەیسەلمێنێت .. تێبینی دەکەیت کە خەڵك بە تایبەتی نزیکەکانت ئەم بیرۆکەیە قەبوڵ ناکەن،**
**وە جێ بەجێکردنەکەی بە قورس دەزانن، ڕەنگە بەهۆی نامۆبوونیەوە ..**
**ئەوەی پەسەندی دەکات و سەرلەنوێ دەیخوێنێد ئەو نەوەیەیە کە بە دوای ئەم نەوەیەی ئێمەن .. بۆیە مەگەڕێیەوە بۆ دواوەوە کاتێك دەبینیت هەندێك کەس بیرۆکەکەت قەبوڵ ناکەن .. بەڵکو بینوسەوە و هەوڵ بدە بڵاوی بکەیتەوە دوای بەداواداچوونت بۆی، وە ئەو پەندەت لەبیر بێت کە دەڵێت: (( مغني الحي لا يُطرب الحي ))، واتا: گۆرانی بێژی گەرەك بۆ گەرەك گۆرانی ناڵێت ..**
**درێژە بە بیرۆکەکەت بدە، ڕەنگە ڕۆژێك لە ڕۆژان مێژوو لە لاپەڕەکانیدا بتنوسێت کە فڵان ... خاوەنی ئەم بیرۆکەیەیە یان یەکەم کەس بووە کە دەستی کردووە بە تاقیکردنەوەی!.**

***  *  ***

سەرکەوتن  وێنەی زۆری هەیە، تەنها بە سەرکەوتنی ئەکادیمی (خوێندن) سنوردار نیە، بەڵکو ئەوە دەبێتە هۆی کردنەوەی ئاسۆکان بۆ ئەوەی توانا ئەفسوناویەکانی خۆت و بەهرەی داهێنەرانەی خۆت ببینێت،
ڕەنگە یەکێك سەرکەوتوو بێت لە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان، یان لە شوێنی کارەکەیدا، یان ڕەنگە هەستێکی داهێنەرانەی هەبێت کە کەسی تر نەتوانێت وەکو ئەو بیر لە چارەسەری کێشەکان بکاتەوە، و چارسەری جیاواز پێشنیار بکات .. وەە گەورەترین سەرکەوتن: ئەویە کە کەسێك ژیانی دونیایی تێ پەڕێنێت بە شایەتی کارە چاکەکانی وە بخرێتە بەهەشتەوە بە ڕەحمی خودا ..
وە هەندێ کەسیش بێ بەش بوونە لە زانست و زانیاری بەهۆی بارودۆخیانەوە، دەڵێن تازە تەمەنمان گەورە بووە و ئێمە هیچ توانامان نەماوە بۆ وەرگرتنی زانیاری و تێگەیشتن و لەبەرکردن .. بەو کەسانە دەڵێم: زانست تەمەنی دیاری کراوی نیە، خەڵك دەناسم قورئانی پیرۆزیان لەبەر کردووە لە تەمەنی پەنجا شەستساڵیدا! ...
خوێندنەوە بیر فراوان دەکات، زۆر کەسی پیر هەن کە مێژوو ناوی تۆمار کردون سەرەڕای ئەوەی کە لە تەمەنی پیرییدا ئەو زانیاریەشیان وەرگرتبوو .. نابغە الزبیانی کە یەکەم شەعری ووت تەمەنی لە سەروی شەستەکان بووە، فەیلەسوفی ئەڵمانی شوبنهاور ناوبانگی سەرسامی کرد کاتێك ئەو نزیك دەبووە لە حەفتا ساڵی، وە ئەفلاتۆن دەستی بە نوسین نەکرد تا تەمەنی چل و هەشت ساڵی، وە زۆر کەسی تر ..

*    *    *

هەموو مرۆڤێکی سەرکەوتوو لە ژیانیدا، لە قۆناغێکدا تینوی وشەی هاندان و ستایش و پشتگیریە، پێوستە لە خوارەوەی پەراوێزیەکانی بێت ئەو کەسەی پشتیوانی لێ دەکات و هیوا دەخوازێت بە متمانەوە سەختیەکان تێ پەڕێنێت، وە ڕەنگە ئەو کەسە دایك بێت یان باوك یان برا، یان ڕەنگە هاوڕێیەك بێت ..

* * *

هەمیشە بۆ باشتر هەوڵ بدە، هەموو هەوڵ و توانایەکی خۆت بەکار بهێنە بۆ سەرکەوتن، هەموو وزەت بەتاڵ بکە لە کارەکەت، بۆ ئەوەی لە کاتی شکستدا تووشی دڵتەنگی نەبیت، چونکە تۆ هەموو توانا و وزەیەکی خۆتت بەکار هێناوە بۆی ..

[ ولا يكلف الله نفساً إلا وُسعها ] .. وە دوبارە هەوڵ بدە، و سوود لە هەڵەکانی ڕابردووت وەربگرە بە ڕاستکردنەوەیان ..

* * *

ڕەنگە هەموو مرۆڤێك لە ژیانیدا بە شێوەیەکی کاتی بکەوێتە ناو چاڵی شکستەوە، هەندێك کەس ئەو خۆڵەی لەسەری کەڵەکە بووە لا دەبات و بە پێکەنینەوە لە چاڵەکە دێتە دەرەوە، بە پەرۆشە بۆ ئەزموونی نوێ .. دەزانێت کە هەڵە باجێکی سەروەریە لە ژیانی ئەو کەسەی کە هەوڵدەدات بەرەو لووتکەی سەرکەوتن سەرکەوێت، خەڵك سەرسام دەبن بە بوونی ئەو مرۆڤە دەگمەنانە، شکست دەکاتە سەرەتایەکی نوێ بۆ ژیانی، شکستەکەی دەگۆڕێت بۆ سەرکەوتن بە ڕیگایەکی جیاواز، ئەو لە باڵەکۆنی بەتاڵەوە بۆ دەروبەری نا ڕوانێت، بەڵکو هەیشە چاوەڕێی هیوایە لە هەموو کارێك کە دەیکات ..

وە هەندێ کەسیش لە بنی چاڵەکە دەمێنێتەوە و چاوەڕێی کەسێکە کە بێت یارمەتی بدات لە دەرچوون، و لە هەموو شتێکدا پشت بە کەسانی تر دەبەستێت، شکست لە ناخیدا دەژی وای لێدەکات جگە لە قورسی و زەحمەتی هیچی تر نەبینێت لە کاردا، و بەردەوام شکست دەهێنیت، کارە ئاسانەکانی لا قورس دەبن، نەك وەك ئەو مرۆڤە مەزنەی کە کاروباری زەحمەت زۆر ئاسان و لووس دەبینێت و سەیری لەوە دوورتر دەکات ..

لە کۆتاییدا هەردووکیان کەوتنە ناو هەمان چاڵەوە، بەڵام کەسی یەکەم بە ڕوونی سەیری ئامانجەکەی کرد؛ چونکە هەموو تۆزەکانی دەوربەری لە پێش چای لابرد، بەڵام کەسی دووەمیان تۆزەکەی لە پێش چاوی هێشتەوە و نەیتوانی ببینێت لە دوای ئەم تۆزە چی ڕوویداوە ..

هەوڵ بدە خۆت ڕازی بکەیت بەوەی کە تۆ لە هەموو کارێك کە دەیکەیت سەرکەوتوو دەبیت، و دواتر خۆت دەبینیەوە کە هەستاوی بە ئەنجامدانی شتی چاوەڕوان نەکراو، هەمیشە گوومانی باش بەرە بە ئافرێنەرەکەت ..

* * *

**کاتێك مرۆڤ لە شتێکدا شکست دێنێت، خەم بۆ شکستهێنانەکەی دەخوات، ڕەنگە لەبەر ئەوە بێت کە پێشتر پلانی بۆ دانەناوە، یان پلانیشی دانابێت .. بەڵام بەهۆی حیکمەتێکی خودا شکستی هێنابێت، هەوڵدەدات بجەنگێت لەگەڵ ئەو ئازارەیدا، متمانە بە خۆبوونی کەم دەبێتەوە، و لاواز دەبێت، خۆی بە شکستخواردو دادەنێت، ئەو گەوهەر و بەهرەیەیی کە لە ناخیدان لەبیر دەکات؛ بەهۆی بەستنەوەی کەشتیە سەرکەوتووەکەی لە ئەشکەوتی مەحاڵدا .. ئێمە بە جۆرێك سەیری شکست دەکەین کە هەموو بەهرەکانمان لەناو دەبات ..**
**بەڵا ڕێی تێ ئەچێت (معقولە) هەموو ئەو کەسە سەرکەوتوو و جیاوازانەی کە مێژوو ناوی تۆماری کردوون وەستابێتن لە یەکەم وێستگەی تووشبوون بە شکست .. بە دڵنیایەوە نەخێر .. ئەوەی شکست نەهێنێت سەرکەوتوو نابێت، و تامی سەرکەوتنیش ناکات کاتێك سەردەکەوێت، سەرکەوتووەکان ئەو کەسانەن کە سوور بوون لە سەرکەووتن کتێك سواری کەشتی سەرکەووتن بوون سەرەڕای سەختی و گەردەلولی زەریا و دەریاکان هەوڵیاندەدا ئەوانە دووربخەنەوە لە سەرکەوتنەکانیان، دەبێت شکستەکەت بکەیتە مۆمێك ڕێگات ڕووناك بکاتەوە بۆ ئەوەی بەهێز بیت .. نەك لە تاریکیدا بمێنیتەوە و بڵێیت: مەحاڵە!، دواتر کەس هەیە لە ئێمە تووشی  شکست نەهاتبێت!.. بەڵام جیاوازی نێوانمان هەستانەوەیە دوای شکست ..**

*     *     *

**وشەی ئەرێنی بوون بەکار بهێنە لە فەرهەنگی قسەکردنتدا لەبری ئەوەی بە شێوەیەکی نەرێنی و نەشیاو قسە بکەیت، بۆ نموونە وشەی ( فڵان گێلە ) بگۆڕە بە: ( فڵان تێناگات ) .. وە لە جیاتی ئەوەی بڵێیت: ( من نەفرەت لەو شتە دەکەم ) بڵێ: (من حەزم لەو شتە نیە ) .. زمانت دەبوژێتەوە بەو وشانەی لە فەرهەنگی مێشکت هەڵگیراون، وە بە پشتیوانی خودا دەبیتە کەسێکی ئەرێنی، و ئەرێنی بوونیش دەبەخشیتە دەوروبەرەکەت ..**

*     *     *

**خوێی ژیان***

**ژیانی هیچ کەسێك بێ خەم و خەفەت و کێشە نیە، دەوڵەمەند گیروگرفتی خۆی هەیە، و هەژاریش بەهەمان شێوە، و کارێکار، و گەورە، و بچووك، و بێکار، ئەوە سونەتی خودایە لە ژیان بۆ ئەوەی مرۆڤ لە هیلاکی و ناخۆشیشدا بژی [[ لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ فِي كَبَدٍ ]] ( البلد: ٤ )، گرینگ نیە چۆنیەتی ئەو نیگەرانی و ئەو کێشانەی کە لە ڕێگاماندا تووشی دەبین، گرنگ ئەوەیە چۆن سەیری بکەین، ئایا ئێمە گەشبینین بە چارەنووسی خودا و کاروبارمان سپاردەی ئەو کردووە و مووژدە دراوین بە دەرئەنجامی خۆڕاگریمان؟ یان ئێمە هەمیشە سەرمان لێ شێواوە لە کارەکانماندا، و ڕەشبین دەبین و لۆمەی شانسمان دەکەین، و گوومانی باش نابەرین بە خودا!.**

***　*　***

**ڕووبەڕووی کێشەکانی ژیانت بەرەوە وەك ئەوەی تەحەدی (چاڵێنج) بکەیت، چارەسەری بۆ بدۆزەوە، و هەرگیز لێی ڕامەکە هەر چەندە بچووك بێت یان گەورە بێت، ڕاکردن لێی ئاڵۆزی دەکات، وە دواتر دەبێتە کابوسێکی بێزارکەر شوێنت دەکەوێت و بە خەبەرت دێنێتەوە پێش ئەوەی بخەویت، هەموو کێشەیەك چارەسەری هەیە لەگەڵ تۆویەك کە لە ناویدا هەڵکەوتووە و گەشە دەکات تەنها ئەو کاتەی تۆ دەتەوێ، بۆیە هەرگیز پێویست ناکات قەلەق بیت، بۆ هەموو کێشەیەك کە ڕووبەڕووی دەبینەوە وانەیەکی بێ کۆتا لە عیبرەت فێر دەبین، کاتێك کەوتیتە کێشەیەکەوە سەیری لایەنە ئەرێنیەکی بکە، تۆ چۆن فێر بوویت، چۆن دۆستەکەت لە دوژمنەکەت جیاکردەوە، دوور لەو شتە نەرێنیانەی کە ڕووبەڕووی بویتەتەوە ..**
**هەروها بیر لەو کێشانە بکەوە کە تێت پەڕاندووە لە ماوەی تەمەنتدا، و سوپاسی خودا بکە لەسەر تێ پەڕبوونیان، وە ئەگەر گەڕایەوە ئەوە بەسە بۆ ئەوەی بزانین چۆن لە دەستی ڕزگارت دەبێت، ئەوەش بزانە کە ئەو زەحمەتیانەی لە تەمەنی منداڵییدا تووشی بوویت واتا و بەها و پوختەکردنت زیاتر دەکات وەك کەسێك کە تووشی هیچ نەبووە!.**

**کەسێکی ئەرێنی بە لە هەڵسوکەوتەکانت، وە حوکم لەسەر مێشکت بدە کە کێشەکان تەنها تاقیکردنەوەیەکە وەك چارەسەرێك بۆ تۆ تەنها بۆ ئەوەی تاقیبکرێیتەوە و هێزت زیاد بکات ..**
**پشت بە خودا ببەستە و تێی پەڕێنە.**
**ژیان فێری کردم کە منداڵ لە یەکەم ڕۆژی قوتابخانەدا،کاتێك جانتاکەی هەڵدەگرێ، سەرەتا بۆی گران دەبێت و ڕێگاکەی بۆ قورس دەبێت، و دەگری .. کاتێك دەستدەکات بە ڕێچکەکەی و چێژی زانست لە ژیان تام دەکات، ڕێگاکەی لە هەندێك شتدا بۆ ئاسان دەبێت، بێ گوێدانە ئەو دژواریانەی ڕووبەڕووی دەبێتەوە لە ڕێگاکەیدا، وەك ئەو کەسەی کە نیگەرانیەکانی بە پشتیەوە هەڵدەواسێ، لەو نیگەرانیانەی کە کەڵەکە بوونە لەسەری کێوێك دروستدەکات، واتای ژیان دژوار دەکات و دەستکاری واتاکانی خۆشەویستی و وەفا و هیوا دەکات، وە دەیگۆڕێت بۆ خەم و خەفەت و فرمێسك کە لە گلێنەی چاوەکانی دەکەوێتە خوارەوە .. بۆیە ناتوانێت ڕێچکەی ژیان بەردەوامی پێ بدات ..**
**با بە گەشبینیەوە ژیان قەبوڵ بکەین و بیر لە نیگەرانیەکان نەکەینەوە، بەڵکو هەمیشە فڕێی بدە ناو تەنەکەی خۆڵەوە ..**
**ئێمە تەنها کەس نین کە ئازار دەچێژین ..**

* * *

## تەنیایی*

تەنیایی لەگەڵ خودا و لە تاریکی شەودا کاتێك ئەوانی تر خەوتون، چارەسەری کێشە و کاروبارەکانتە بە پشتیوانی خودا، ئەگەر دەتەوێت ئاوەتەکانت بەدی بهێنیت، یان داوای لێخۆشبوون  و بەهەشت لە خودا بکەیت، یان کاتێك لەلایەن کەسێکەوە دەچەوسێیتەوە لە ژوورێکی تاریکدا دابنیشە و هەست بەوە بکە کە خودا گوێی لێتەوە و چاودێرتە، لە بەردەم خودا بگری، وەك منداڵ بە لە تەنیاییتدا، چونکە منداڵ گەر شتێکی بووێت فرمێسکی لەپێناو دەرێژێت و ئارام نابێتەوە تا ئەو شتەی کە دەیەوێت بەدەستی دەهێنێت ..
و داوای پێداویستیەکانت بکە لە پەروەردگاری مهرەبان و باڵادەست، و کاروبارت ڕادەستی پەروەردگاری مەزن و بکە، و گوومانی باشی پێ بەرە، ئەمە وات لێ دەکات زیاتر گەشبین و ڕازی بیت بەو بەشەی کە خودا لە چاکە پێی بەخشیووی ..
وە بزانە کە خودا شتێکت لێ ناسێنێ مەگەر بۆت قەربوو نەکاتەوە بە باشە وە باشتر لەوە ئەگەر ئارمت گرت و دوعای زۆرت کرد،
خەم مەخۆ بۆ کارەساتەکان .. تۆ لە لایەن خوداوە پاداشت دەکرێیت، خودا دەفەرمووێت: [[ سَلامٌ عَلَيْكُمْ بِما صَبَرْتُمْ فَنِعْمَ عُقْبَى الدَّارِ ]] ( الرعد: ٢٤ ) ..
و دڵتەنگ مەبە لەسەر هیچ شتێك، چونکە ئەوەی بەسەرتدا دێت لە خودایەکی میهرەبانەوەیە ..

* * *

**باسی دۆخی دڵتم بۆ بکە لە تەنیایتدا! ..**
**ئایا ئەو نزیکە لە خودا و گوێڕایەڵ کردنی! ..**
**یان نافەرمانی خودا دەکات!..**
**وەك چۆن خوداپەرەستی لە تانیایدا پاداشتی زۆر گەورەیە، هەروەها تاوانکردن لە تەنیایدا زۆر کارێکی ترسناکە، جگە لە خودا هیچ کەسێکی تر نامان بینێت، بەبێ خۆنیشاندان، دوور لە چاوی هەموو کەسێکەوە، هەندێکجار ئێمە دەرك بەوە ناکەین و نازانین تا چەند لەگەڵ خودا ڕاستین مەگەر لە کاتی تەیاییدا نەبێت! ..**

## شكاندنی ڕۆتین*

ئایا دوعا کردن تەنها بە نووسین بەردەوامە لە ماڵپەرە کۆمەڵایەتیەکان، و ئایا لە ڕاستیدا زمانەکان لە ووتنەوەی دوعاکان ووشک بوونەوە! ..
وە تا ئێستا ئاواتەکانت لای خودا دەخوازیت و بێ دەست بەرزکردنەوە بۆی و کڕنوش بردن! ..

بیرۆکەیەك بۆ گۆڕێن:
با کاتێك دوعایەك دەنووسین لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان، لە دڵەوە بێت بۆ کەسەکە، و دەست بەرز بکەوە بۆ بەدیهێنەرەکەت، بەم شێوە ئێمە دوعاکەمان بەدەست خست، هەرچەندە ئێستا نووسین زیاتر بووە لە قسەکردن، با نووسین و کۆمێنتەکان لە دڵێکی دڵسۆزانە لەپێناو خودا بێت، تا فریشتەی لای ڕاستمان بڵێت: (( ولك بالمثل )) واتا: بۆ تۆش بەهەمان شێوە ..

*   *   *

هەوڵێك بۆ گۆڕین:

جارێك پێش ئەوەی بخەویت وەسیەتێك بنوسە، هەوڵبدە هەست بکەی کە ئێستا لە هەر کاتێکدا بێت ڕەنگە ئەم ژیانە جێ بەهێڵی، دڵت بەتاڵ بکەوە لە ڕق و کینە و ئیرەیی، دونیا زۆر لەوە بچووکترە کە ڕق و کینە هەڵبگرین لەبەرامبەر کەسێك، گۆڕێکت هەیە کە بانگت دەکات، و ڕۆژێك لە ڕۆژان خۆڵ هەموو جەستەت دادەپۆشێ، باش دەزانین کە لێ پێچینەوە هەیە دواتر بەهەشت و دۆزەخ، بەڵام ئەوە لەبیر دەکەین کە مردن یەکەم خاڵی پەڕینەوەمانە، ژیانت کورتە، بە شتێك کە خودا توڕە دەکات بەسەری مەبە، لە هەموو کرێکارەکان و لە هەموو کەسێك خۆش بە لە پێناو ڕەزامەندی خودای دروستکەری بەخشەر، دڵخۆش بە خودا گەورەیە، بە لێخۆشبوونت چاکەت بۆ دەنوسرێت، و پاداشتت پێ دەبەخشرێت ..

*   *   *

**شکانی دڵ***

**لە زۆرێك لە کاتەکانی ژیانمان هەست بە شکان دەکەین لە نێوان خۆما و ناخمان بە بێ ئەوەی کەس پێمان بزانێت .. کاتێك هەست بە ترس دەکەین بە هەستێکی شکستخواردویی دەژین، وەکاتێك لە خوێندنەکەمان سەرکەوتوو نابین هەست بە شکست دەکەین .. وە کاتێك دەخەویت و ئەوانی تر هەستاون شەونوێژ دەکەن و هەڵناسیت لە تەنیشتیاندا نوێژ بکەیت بێگومان هەست بە شکست دەکەیت لە نێوان خۆت و ناختدا کاتێك لێ پێچینەوەی لەگەڵ دەکەیت .. وە کاتێك سەیری تەلەفزیۆن دەکەیت و گوێ لە گۆرانی دەگریت ئەوانی تریش ستایشی و یادی خودا دەکەنەوە و دەمیان بۆن خۆش دەکان بە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز .. بە دڵنیاییەوە هەست بە شکست دەکەیت .. وە .. وە ...**

**بەڵام شکستی ڕاستەقینە ئەوەیە کاتێك دەمریت و هیچ کارێکی چەکەت پێشکەش نەکردبێ، وە دەبیتە پەند بۆ خەڵکی، و کردەوەکانت دەوەستێن و هیچ بە کەڵکت نایەت لە گۆڕەکەت تەنها ئەو کارانەی کە لە ژیانتدا ئەنجامت دەدا .. چەند دارمێنەرە کاتێك ڕۆژی لێ پرسینەوە دێت و لە رۆژی دوای بێ کردەوەی باش و دڵسۆزانە دەوەستیت، و ئەوانی تریش زۆریان پێشکەش کردووە ..**

***     *     ***

## خەیاڵی دڵ*

خەیاڵ نیعمەتە، دوورە لە ڕاستی، مرۆڤ دەتوانێت لە جیهانی خەیاڵدا بژی، لەوێدا کەس نیە جگە لە خۆی، هیچ کەسێك لەو کەسانەی تێدا نیە کە ژیانیان تەنگ کرووە .. کاتێك جیهانێك بۆ خۆی دروستدەکات لە خەیاڵیدا،هەموو مرۆڤێکی بیر ناکەوێتەوە، بەڵکو تەنیا ئەوانەی بیر دەکەوێتەوە کە خۆشی دەوێن و ڕۆژێك لە ڕۆژان ڕۆژگاری لەگەڵ هاوبەشی پێ کردوون، ئەوانی خەملاندوە کاتێك زەردەخەنە ڕاستەقینەکانی دڵی بینیون، نەك زەردەخەنەیەکی دروستکەر، بەڵکو ئەوەی بە خۆشەویستیەوە پەنجەمۆری خۆی لە رۆژەکانی داناوە، وە ڕەنگە ئەو پەنجەمۆرەنەش قەد د دووبارە نەبێتەوە ..
ئێمە دەزانین کە هەرکەسێك لە ژیانمان ڕووبەڕووی دەبینەوە کاریگەری لەسەرمان دروستدەکات و کاریگەی لەسەر دروستدەکەین، و دواتر چارەنووس لەیەکمان جیا دەکاتەوە، لەبیری ناکەین؛ چونکە ڕەنگە جیاببووینێتەوە و ئێمە بەشێکمان لە ئەو هەڵگرتبێ و ئەویش بەشێکی لە ئێمە هەڵگرتبێ، بەشێکی زۆر لە ئاکارەکانی ئەوانمان هەڵگرتبێ، ڕەنگە زەردەخەنەکەی، پێکەنینەکەی، گەشبینیەکەی، شێوازی قسەکردنەکەی، و تەناتەت یاد و بیرکردنەوەی لە ساتە تەنگەکانیشدا ..
ئێمە خەیاڵی زۆر شت دەکەین کە ڕەنگە لە ڕاستی زۆر دوور بێت ..
خەیاڵی دڵخۆشبوون دەکەین لە ڕۆژەکانمان بۆ ئەوەی هەست بە دڵخۆشی بکەین .. بەڵام خەڵك هەیە تەنانەت لە خەیاڵەکانیشیان توڕە و نائاسوودەن ..

* * *

**زۆر کەس هەن ژیانیان لە خەیاڵدا وەك ژیانێکی ساختە وێنا دەکەن .. و یەکەم کەسن تێیدا دەژین و یەکەم کەسن کە باوەڕیان بەو خەیاڵە ساختە هەیە .. وە هەروەها یەکەم کەسن کە تووشی شۆك دەبن بەو خەیاڵە ساختیە، وە هەڵناستنەوە لەو خەونە تا بە زلەیەکی بە هێز نەبێت وە هەموو شتێك دوای ئەوە تەواو دەبێت ..**
**با خەیاڵەکان بە کردار بکەینە ڕاستی، نەك تەنها بە ئاوات خواستن!.**

* * *

**زۆر کەس هەیە دەڵێن ئێمە ئەوە دەکەین ئێمە ئەوە دەکەین .. بەڵام کەمێك لەوان قسەکانیان وەردەگێڕن بە کردار بۆ ئەوەی خۆی بسەلمێنێت و بناغەی کەسایەتی خۆی پێ بەهێز بکات، ڕاستگۆی تەنها بە قسەکردن نیە، بەڵکو بە کرداریشە ..**

* * *

**پەڕینەوە***

**ڕازی کردنی خەڵکی ئامانجێکە کە نایەتە دەست؛ بۆیە دەبێت ویژدانمان سنووردار بکەین بۆ مەودای ڕازی کردنی خودا پاشان دایك و باوکمان، وە لە ناخی خۆمان ڕازی بین، چونکە هەرچی بکەیت بۆ ئەوەی لە لووتکەی دڵیاندا بیت لە ڕازیکردنیان ناتوانیت؛ لەبەر ئەوەی چینێك لە خەڵك هەیە کە ڕێزی ئەو قوربانی دانەت ناگرێت، وە هەروەها پێویستە لە سەرت کە کەسایەتیت بپارێزیت، و هەڵسوکەوت بکەیت بەو جۆرەی کە خۆت دەتەوێ نەك بەو جۆرەی کە ئاوان دەیانەوێت لێت، گەر ویستت پێبکەنی لەو کاتەی دەتەوێت پێبکەنە، و مەترسە لەوەی بە گەمژە ناوت بەرن، گەر ویستت بگریت بگری، شەرم مەکە لەوەی خەڵك بە هەستیار بانگت بکەن، لە دەستپێشخەری مەوەستە لە ترسی ئەوەی پێت بڵێن چەند بە مەڕاقە (فزوڵە)، وە هەستەکانت دەربڕە، و مەیبەستەوە لە ترسی ئەوەی خەڵکی هەستەکانت ڕەت بکەنەوە، وە مەترسە لە خستنە ڕووی بیرۆکە و خەونەکانت لە پێش خەڵکی لە ترسی لەدەستدانیان، ئازاد بە!.**

* * *

**مرۆڤی باش خەڵکی دەوروبەری هەموو بە باش دەبینێت، وە هیچ شتێکی تریان لێ نابینێت جگە لە چاکە، لایەنە نەرێنیەکان پشتگوێ دەخات، هەروەها مرۆڤی خراپ هەموو خەڵکی دەوروبەری وەك خۆی دەبینێت، و هەمیشە بەردەوام بە دوای لایەنە نەرێنیەکانەوەیە و ئەرێنیەکان لە یاد دەکات، وەك ئەوەی تۆز چووبێتە ناوەڕاستی چاوەکانی و بە ڕوونی کوێری کردبێ .**

* * *

**مرۆڤ پێویستە ئەوە بنرخێنێت کە لە ژیانیدا لەسەر چی پەشیمان دەبێتەوە .. ئایا پەشیمان دەبیتەوە لە سەر ڕووداوەکانی ڕابردوو، یان لەسەر کەسێك کە هاتبێتە ژیانیەوە و دەرچووبێت ..؟.**
**گومانی تێدا نیە کە پەشیمانی لەکاتێکدا بووە کە توانای چاکەی هەبووە و نەیکردووە .. وە هەندێك کەس دەسپێشخەری دەکەن، ئەوان دەستپێشخەری دەکەن بۆ کاری چاکە بێ ئەوەی داوایان لێ بکرێت، وە هەندێکیش بە شەرم بوونی گرێی دەدات بۆ ئەوەی کاری باش ئەنجام نەدا .. خوایە گیان لەو کەسانەمان بکەیت کە دەست پێشخەری دەکەن لە کاری چاکە و خوداپەرەستی.**

***　　*　　***

**کێشەی جۆرابەجۆر هەن کە ڕەنگە لە ژیانماندا ڕووبەڕووی ببینەوە، ئەوەی پێویستە لەسەرمان وەستانە بە ڕوویداو و سوود بینینە لێی و فڕێ دانیەتی لە پشتەوە، وە درێژە بە بیرکردنەوە لێی نەدەین؛ بۆ ئەوەی هەرگیز بێ جووڵە نەوەستین؛ چونکە ئەم دژواریانە دەبێتە بەربەستێکی بێ هیوای پتەو کە لاپەڕەی ڕۆژەکەمان دادەخات لە گەشبینی و خۆری هیوا ..**

***　　*　　***

**(( زۆربەی هەرە زۆری بیرۆکە و ووتەکانی ئەم کتێبە لە تەمەنی چواردەساڵیمدا نوسیوومە و پارێزگاریم لێ کردوون، ئەوە خەونێك بوو بەلای منەوە کە لە کتێبێکدا بڵاوی بکەمەوە وەك ئەمڕۆ ))**
**بێ ئومێد مەبە، رۆژێك لە ڕۆژان تۆویی خەونەکانت سەوز دەبێت بە هێزی خودا.**

***　　*　　***

# ناوەڕۆك

# ژیانامەی نوسەر:

**الآء صفوان الدهنه**

**لە دایك بووی ١٩٩٤/٧/٢٨م**
**قوتابی زانکۆیە لە زانکۆی الطیبة لە بایەلۆجیایی گشتی.**
**لە سوریا شاری حەمایە، و دانیشتووی مەدینەیە، نوسەر و داکۆکیکەرە لە بواری کاردا، و چالاکڤانی خۆبەخش، و داهێنەر، و توێژەرە ..**
**کارە خوازراوەکانی: نوسین و خوێندنەوە و وێنەکێشان و بەرگ دوری ..**
**هەستەوە بە نوسینی ( معالم في دروبي ) لە تەمەنی چواردە ساڵیدا.**
**چالاکیەکانی: کتێبێکی بڵاوکردۆتەوە بە ناوی: ( ثرثرة صامتة ) ..**
**ئەندامی جێبەجێکارە لە گروپی ( تميُّزي تطوُّعي ) لە شاری مەدینە ..**
**چەندین داهێنانی هەیە ..**
**پلەی یەکەمی هێناوە لە ئۆلۆمپیادی جیهانی ( المقام ) لە شاری مەدینە لە ساڵی ٢٠١١ لە داهێنانێك بە ناونیشانی: ( وداعاً للنمل في منزلك ).**
**وە پلەی یەکەمی بەدەستهێناوە لەسەر ئاستی وڵاتی سعودیە لە ئۆلۆمپیادی جیهانی لە خولی بەکاربەریدا لە ساڵی ٢٠١٢ لە پەرەپێدانی داهێنانەکەی بە ناونیشانی: ( طارد النمل الطبيعي ).**
**چەندین خەڵاتی وەرگرتووە لە پێشبڕکێی خوا لێخۆشبوو ( الأمير نايف ) بۆ لەبەرکردنی فەرموودەکانی پێغەمبەر ( د.خ ) بە پلەی یەکەم لەگەڵ ڕێز ..**
**وە چەندین خەڵاتی وەرگرتووە لە لەبەر کردنی جوزمەکانی قورئانی پیرۆز.**
**وە پلەی دووەم و سێیەمی هێناوە لە ئامادەکاری پێنجەمین کۆنفڕانسی جیهانی لەسەر ڕێگای نوێگەری لە زانکۆی طيبة بە داهێنانی ( طارد الحشرات ) و( المرهم الفعّال لعلاج البشرة ) ..**